نیکاح بکەین بە ئەوبێ یەعنی ( مەئەلا ) • لە پاشا عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە مەئالی شەریفی وایە : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە ئەو طەییباتەی کە خوا بۆی حەلاڵکردوون حەرامی مەکەن لە خۆتان ، لە ئەحکامی ئیلاهییە تەجاوز مەکەن ؛ چونکی خوا ئەوانەی کە لە ئەحکامی ئیلاهییە ئەچنەدەرێی خۆش ناوێ •

ژنهێنان ، نانخواردن ، نوستن ، ئینتیفاع بە نیعمەتی خوا حەتتا نیکاحی صیغەیش لەوانەیە کە ( طیب )ن و خوا حەلاڵی کردوون •

**آداب الاتيان الى اهله(١) :**

١٠/٣٧١٣ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : لو أن أحدهم إذا أراد أن يأتي أهله قال : بسم الله أللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان مارزقتنا •• فإنه إن يقدّر بينهما ولد في ذلك لم يضره شيطان أبدا ح ـ ٦٦/٦ ، م ـ ١٩٨/٦ ، ح ـ ٢١٠/١ ، ٢٢٨ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : کە یەکێ لە ئێوە ئیرادەی کرد کە لەگەڵ ژنی خۆی دروست بێ بڵێ : خوایا لە شەیطانمان بپارێزەو شەیطان دوورخەرەوە لەو منالەی کە کردووتە بە رزقی ئێمە • کە ئەوەتان وت ئەگەر خوا لەو موجامەعەیە منالێکی موقەددەر کردبێ ئەو منالە بە ئەبەدیی هیچ شەیتانێ زەرەری پێ ناگەیێنێ •

[ عەبدورڕەزاق بە مورسەلیی لە حەسەنی بەصرییەوە ـ رحمهما الله ـ ریوایەت ئەکا کە ئینسان لەگەڵ ئەهلی خۆیا موجامەعەی کرد بڵێ

(١) ئادابی چوونەلای خێزان •

( بسم الله ، أللهم بارك لنا في ما رزقتنا ولا تجعل للشيطان نصيبا فيما رزقتنا وكان يرجي إن حملت أن يكون ولداً صالحا ) : به موعاوەنەتی ناوی خواوه ئەم ئیشه دەست پێئەکەم ، خوایا بەرەکەتمان بۆ بخەیتە ئەوەی کـه لـەم موعامەلە ئەیکەی بە رزقی ئێمه • نەصیبی شـەیطان مەخەرە ئەوەی کـه ئەیکەی بە رزقی ئێمە ، کە ئەوەی وت ئومێد هەیە کە ئەوی لەو موعامەلە پەیدا ئەبێ ئەولادێکی صالح بێ = قەسطەلانی : ٨/٦٩ =] •

**لە پشتەوە موجامعەکردن لەگەڵ ژنی خۆی :**

١١/٣٧١٤ ـ جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : كانت اليهود تقول: إذا أتى الرجل امرأته من دبرها في قبلهـا كـان الـولـد أحـول • فنزلت : ( نساؤكم حرث لكم فأتوا حرثكم أنى شئتم )[1] م ـ ٦/١٩٩ ، ح-٧/٣٤ ، ت ، ن ، جه • وزاد في حديث النعمان عن الزهري يعني إلى جابر : إن شاء مجبية [ بەدەمەوە ] وإن شاء غير مجبية غير أن ذلك في صمام واحد [ أي في ثقب واحـد وهو القبل ] •

## تەرجەمە :

جابير ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : یەهوودیی ئەیانوت : ئەگەر ئینسان لەگەڵ ژنی خۆی لە پشتەوە لە ( قبل ) یا موجامەعە بکا منـاڵی لێ ببێ مناڵەکەی خێل ئەبێ ، ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە ئەفەرموێ : فەرجی ژنی ئێـوە جێـگە زەراعەتتانە لـە هـەر کوێوە ئـارەزووتانـە بچنـە نـاو جێ زەراعەتەکانەوە ، یەعنی لە پێشەوە بێ ، لە پاشەوە بێ ، بە پشـتەوە بێ ، بە دەمەوە بێ ، لەسەر تەنیشت بێ ••• بەو شەرتە کە هەر لە قوبولیەوە بێ

(١) البقـرة / ٢٢٣ •

به ( دبر ) نهبێ ٠ تهماشای جهڵدی حهوتهمی قهســــطهلانیی له صهحیفهی سیودوو سیوسێو سیوچوار بکه له تهفسیری ئهو ئایهتهدا ٠

١٢/٣٧١٥ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فأبت أن تجيىء لعنتها الملائكـة حتى تصبح [ حتى ترجع ٠ أخرى ] ٩٢/٨ ، م ـ ٢٠٠/٦ وفي أخرى منه : إلا كان الذي في السماء ساخطا عليها حتى يرضى عنهـا م ـ ٢٠٠/٦ ، وفي م ـ ٢٠١/٦ : فبات غضبان عليها لعنتها ٠٠٠ إلخ ٠

**تهرجهمه :**

پێغهمهر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فهرمووی : هـهر پیـاوێ ژنی خۆی بانگ بکا بۆ موجامهعه ٠ ئیجابهتی نهکا ، مێردهکهی به رقهوه رۆژ بکاتهوه خوا لهعنهت لهو ژنه ئهکا تا سبهینێ ، له ریوایهتێکا : تا لێی رازیی ئهبێ ٠ له ریوایهتێکا تا ژنهکه پێتهوه لای ٠ له ریوایهتێکا ئهوی حوکمی له ئاسمانا جارییه لێی به غهضهب ئهبێ ٠

١٣/٣٧١٦ ـ عن عبدالله بن زمعة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : لا يجلد أحدكم امرأتـه جلـد العبـد ثم يجامعها في آخر اليـوم ح ـ ٩٧/٨ ٠

١٤/٣٧١٧ ـ وعنه قال : نهى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أن يضحك الرجل مما يخرج من الأنفس ٠ وقال : لم يضرب أحدكم امرأته ضرب الفحل ثم لعله يعانقها ؟ ح ـ ٣٤/٩ ، ح ـ ٤٠٤/٧ ، م ـ ٣٢٢/١٠ ولفظهما ببعض فرق واللفظ للبخاري :

١٥/٣٧١٨ ـ عبدالله بن زمعة [ رضي الله تعالى عنه ] سمع النبي ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ يخطب وذكر الناقة والذي عقر ، فـــقال رسـول الله

ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : إذ انبعث أشقاها ، انبعث لها رجل عزيز عارم [ جبار ] منيع في رهطه مثل أبي زمعة • وذكر النساء ، فقال : يعمد أحدكم يجلد امرأته جلد العبد فلعله يضاجعها في آخر يومه ! ثم وعظهم في ضحكهم من الضرطة وقال : لم يضحك أحدكم مما يفعل ؟ ح ـ ٧/٤٠٤ ، م ـ ١٠/٣٢٢ • ( تەرجەمەی ئەم حەدیثە کافیە ) •

## تەرجەمە :

عەبدوڵلای کوڕی زیمەعە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـم بیست خوطبەی ئەخوێند بەحێی ناقەی صالح ـ عليه السلام ـی کردو بەحێی ئەوەی کە سەری بڕی • فەرمووی : (إذ انبعث أشقاها) پیاوێکی بە قووەتی جەبباری موعتەبەر لە ناو قەومی خۆیا وەك باوکی زیمەعە [ کە باپیری عەبدوڵلایە ] بۆی چوو سەری بڕی • لە پاشادەرحەق ژنان وەعظی بۆ دادان فەرمووی : یەکێ لە ئێوە ئەچێ بۆ ژنەکەی لێیدا وەك لە عەبد ئەدرێ [ وەك لە وشتر ئەدرێ • أخرى ] ئیحتیمالی هەیە لە ئاخری ئەو رۆژەدا لەگەڵی دروست بێو دەست لە ملی بکا • دەرحەق پێکەنین بە کەسێ کە بایەکی لێ‌بەربێتەوە وەعظی بۆ دادان فەرمووی : بۆ بەو کەسە پێ‌ئەکەنێ بایێکی لێ بەربێتەوە •

١٦/٣٧١٩ ـ عن جابر [ رضي الله تعالى عنه ] أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ رأى امرأة فأتى امرأته زينب وهي تمعس منيئة لها [ تدلك جلدا وضع في الدباغ ] فقضى حاجته ثم خرج إلى أصحابه فقال : إن المرأة تقبل في صورة شيطان وتدبر في صورة شيطان ، فإذا [ أحدكم أعجبته المرأة فوقعت في قلبه • أخرى م ] أبصر أحدكم امرأة فليأت أهله ، فإن ذلك يرد مافي نفسه م ـ ٦/١٢٢ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ چاوی بە ژنێ کەوت تەشریفی هاتە لای زەینەب ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئیحتیاجی خۆیی پێ بەجێهێنا ، لەو وەختەدا زەینەب پێستێکی لە هەلآلآ بوو خۆشیئەکرد ، لە پاشا تەشریفی چوە لای ئەصحابی ، فەرمووی : ژن لە صوورەتی شەیطانێکا رووئەکاتە ئینسان ، لە صوورەتی شەیطانێکا پشت لە ئینسان هەڵەکا ، کە یەکێ لە ئێوە ژنێکی دی لای جوانو عەجایب بوو شتێك بە دڵیاهات .. بچێتەوە لەگەڵ ژنی خۆیا دروست بێ ، ئەوە ئەوەی لە دڵیایە ئەیکاتە دەرەوە .

**سوننەتە تەماشای ژن کە ئیرادەی بوو بیهێنێ :**

١٧/٣٧٢٠ ـ أبو هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قال : كنت عند النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فأتاه رجل ، فأخبره أنه تزوج امرأة من الأنصار . فقال له رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : أنظرت إليها ؟ قال : لا . قال : فاذهب فانظر إليها ، فإن في أعين الأنصار شيئا .

وفي أخرى عنه : فقال له النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: هل نظرت إليها ، فإن في عيون الأنصار شيئا ، قال : قد نظرت إليها . قال : على كم تزوجتها ؟ قال على أربع أواق . فقال له النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: على أربع أواق ؟! كأنما تنحتون الفضة من عرض هذا الجبل ! ما عندنا مانعطيك ، ولكن عسى أن نبعثك في بعث تصيب منه . قال : فبعث بعثا إلى بني عبس بعث ذلك الرجل فيهم م ـ ٦/١٦١ .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا بووم ـ صلی الله تعالی علیه ـ پیاوێ هاتە خزمەتی عەرزیکرد : لە ئەنصار

ژنێکم هێناوه[1] • فەرمووی : تەماشات کرد یان نا ؟ عەرزیکرد : خەیر • فەرمووی : بچۆ تەماشای بکە ، لە چاوی ئەنصـارا عەیبێك هەیە • چوو تەماشایکرد ، هاتەوە خزمەتی عەرزی کرد ( فلا منافاة ) فەرمووی : لەسەر چەندت مارەکردوە ؟ عەرزیکرد : لەســەر چوار ئووقیە • فەرمووی : = لەسەر چوار ئووقیە ؟! = وا بزانم ئێوە لە پانی ئەم شاخە زیو دائەتاشن ! ئێستە هیچم لە لا نیە کە بتدەمیّ بۆ مارەیی یەکەی ، ئەمما بەڵکە دەستەییّ خەڵق بنێرم لە ناو ئەوانەدا تۆیش بنێرم لەوە شــتێکت دەســتکەویّ • ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمویّ : دەستەییّ خەڵقی نـاردە سەر بەنیعەبس ئەو پیاوەیشی لەگەڵا ناردن •

سوننەتە مارەیی خەفیف بیّو بە قەد ئیقتیدار بیّ •

**إستئذان الثيب والبـكر[2] :**

١٨/٣٧٢١ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : لا تنكح الأيم حتى تستأمر ، ولا تنكح البكر حتى تستأذن • قالوا : يا رسول الله وكيف إذنها ؟ قـال : أن تسـكت ح ـ ٨/٥٢ ، م ـ ٦/١٥١ ، ن ح ـ ١٠/١٠٥ ، ١٠٦ •

١٩/٣٧٢٢ ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ تقول : سألت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عن الجارية يُنكحها أهلها أتستأمر أم لا ؟ فقال لها رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : نعم تسـتأمر • فقـالت عائشة : فقلت له : فإنها تستحي • فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه

(١) دەبوو لێرەدا بیفەرموایە : ژنێکـم لـە ئەنصار خوازبێنـی کـردوە ، چونکە دوای هێنان تەماشای دەکـاو دەیبینیّ •

(٢) پرسکردن بـە بێوەژنو کچ بۆ مارەبڕین •

وسلم ـ: فذلك إذنها إذا هي سكتت م ـ ٦/١٥٢ ، ح ـ ٨/٥٢ ، ح ـ ١٠/١٠٦ ٠

٢٠/٣٧٢٣ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : الأيم أحق بنفسها من وليها ، والبكر تستأذن في نفسها ، وإذنها صماتها [ وصمتها إقرارها ٠ أخرى ] م ـ ٦/١٥٢ ٠

٢١/٣٧٢٤ ـ عن عقبة بن عامر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : إن أحق الشرط أن يوفى به ما استحللتم به الفروج ح ـ ٨/٦٠ ، ح ـ ٤/٤٢٠ ، م ـ ٦/١٥٠ ، ت ، د ، جه ، ن ٠

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : بێوەژن تا لێی نەپرسرێتو ئەمر نەکا نادرێ بە شوو ٠ بیکر ، یەعنی کچ ، تا ئیذنی لێ نەخوازرێ نادرێ بە شوو ٠ عەرزیانکرد : ( یا رسول الله ) ئیذنی کچ چۆن ئەبێ؟ فەرمووی: کە ئیذنت لێ خواستو بێدەنگ بوو بێدەنگییەکەی ئیذنە٠ [ لای مالیکیی ئەگەر عەلامەتی ڕەزانەبوونی لێدەرکەوت ، مەثەلا کە گریا نادرێ بە شوو ٠ ئیمامی شافیعیی ئەفەرموێ : تەنها گریان کافی نیە ، یەکێ لە تووڕەبوونو ، بۆڵەبۆڵو ، هاوارکردنی پێ ئەوێ ٠ ئەگەر پێکەنی عەلامەتی پێخۆشبوونە ] ٠ حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : (یارسول الله) کچ حەیا ئەکا کە ئیذن بدا ٠ فەرمووی : ڕەزای ئەو بێدەنگبوونە ٠

لە ڕیوایەتێکی ترا حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ: لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـم پرسیی : کەسو کاری کچ

کچەکەیان ئەدەن بە شوو پرسی پێ ئەکەن یان نا ؟ فەرمووی : پرسی پێ ئەکەن • عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : عەرزم کرد : کچ شەرم ئەکا رووی نایێ بڵێ بمدەن بە شوو • فەرمووی : کە بێدەنگ بوو ئەوە ئیذنە • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : بێوەژن لە کەس‌و کاری حەقی زیاترە بەسەر خۆیەوە ، کچ ئیذنی لێ‌ئەخوازرێ بێدەنگ‌بوونی ئیذنەو رەزاو ئیقرارە •

[ ظاهیرو صەریحی ئەم حەدیثانە وا ئەگەیێنێ کە وەلی ( مجبر )[1] نیە ، باوك‌و باپیریش بە بێ رەزا کچ نادەن بە شوو • مەذهەبی حەنەفیی موافیقی ئەم ظاهیرەیە،شافیعیی،مالیك، ئەحمەد ئەفەرموون:باوك‌و باپیر بە بێ ئیذن ئەیدەن بە شوو • ئەبوحەنیفە ئەفەرموێ : بێوەکچ هەموو وەلیێکی : باوك ، برا ، مام ، ئامۆزا ••• ئەیدەن بە شوو ، کە گەورە بوو حەقی خیاری هەیە • [ ئەمما لە دوای خەیاری خیار فائیدەی چیە ؟ ] مالیك ئەفەرموێ : وەصیی باوك بێوە کچ ئەدا بەشوو ، کەس‌و کاری تر نایدا • ئیمامی ئەحمەد ئەفەرموێ : باوك ، باپیر هەر نەوعە کچێکی بیکری گەورە بێ یا بوچووك ، یا بێوەکچی کەمتر لە نۆ ساڵ ئەدا بە شوو ، فەقەط ( دون البلوغ )ی نۆ ساڵ‌و زیاد لە نۆ نادا بە شوو •

ئیمامی شافیعیی ، ئەبویوسف ، محەمەد ـ رحمهم الله ـ ئەفەرموون : بێوەکچ ئەگەر کچێتیەکەی بە جیماع ئیزالەکرابێ وەلی موجبیری نیە • بە غەیری جیماع زائیل بووبێ باوك وەلی موجبیرە • بیکری بالیغە هەموو ئەولیا ئەیدەن بە شوو ، ئیختیلاف لە ئیذن‌لێ‌خواستنا یە • دەلیلی ئەوانەی

(١) واتە : بە زۆر کچ نادا بە شوو و زۆری بەسەریدا نیە .

که ئەفەرموون وەلی موجبیر هەیە مەفهوومی ( الأيم أحق بنفسها )یە یەعنی غەیری یێوە ئەحەق نیە بە نەفسی خۆی •

**[ فەقەط ئەم دەلیلە لە غایەتی ضەعیفیدایە ، موعارەضەی صەریحی ئەحادیث ناکا • ئەگەر مەفهوومی ببوایە لە دوای ئەوەوە نەیئەفەرموو ( والبكر تستاذن ) لەم مەسئەلەدا حەق مەذهەبی ئەبوحەنیفەیە ( والله اعلم ) رەشید ] راجع القسطلاني •**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەفەرمویٚ : لەو شەرتانەی کە لە هەموو شەرتێ لازمترە وەفای پێبکرێ ئەو شەرتەیە کە فەرجی ژنانتان پێ حەلاڵکردوە • یەعنی مارەیی ، نەفەقە ، حوسنی موعاشەرە •

وقال بعض الناس [ أبو حنيفة ] : إن لم تستأذن البكر ولم تزوج ، فاحتال رجل فأقام شاهدي زور أنه تزوجها برضاها ، فأثبت القاضي نكاحها بشهادتهما ، والزوج يعلم أن الشهادة باطلة فلا بأس أن يطأها وهو تزويج صحيح ح - ١٠/١٠٥ •

وقال بعض الناس [أبو حنيفة] : إن هوى رجل جارية يتيمة أو بكرا ، فأبت ، فاحتال =فجاء= بشاهدي زور على أنه تزوجها فأدركت ، فرضيت اليتيمة ، فقبل القاضي شهادة الزور ، والزوج يعلم ببطلان ذلك ، حل له الوطء ح - ١٠/١٠٦ •

وقال بعض الناس [ أبو حنيفة ] : إن احتال إنسان بشاهدي زور على تزويج امرأة ثيب بأمرها ، فأثبت القاضي نكاحها إياه ، والزوج يعلم أنه لم يتزوجها قط ، فإنه يسعه هذا النكاح ، ولا بأس بالمقام له معها ح - ١٠/١٠٦ •

**تەرجەمە :**

مەئالی ئەم سێ فەرموودەی ئەبوحەنیفە ـ رحمه الله تعالى ـ ئەمەیە :

كە کەسێ ئیقامەی شاهیدی زوور بکا لەسەر ئەمە کە ژنێکی بێوەژنی ، یا کچێکی بیکری ، یا کچۆلەیێکی هەتیوی مارەکردوە قازیی حوکمی پێ کرد ئەو نیکاحە (ظاهرا)و (باطنا) صەحیحە ؛ چونکی حاکم حوکمی پێ کردوە ، حوکمی حاکم ( ظاهرا )و ( عند الله ) نافیذە • ئەم فەرموودەی ئەبوحەنیفە ـ رحمه الله ـ موخالیفی صەریحی ئەحادیثەو ئیجتیهادێکی زۆر باطیلە ، لە ( نفس الامر )ا صەحیح نیە • بۆ پیاوەکەیش‌و بۆ ژنەکەیش خەڵوەت‌و موجامەعە حەرامە ، حەتتا بۆ ژنەکە کە چارەی نەما دروستە پیاوەکە بکوژێ، ئەمما حاکم چی بکا ئەبێ بە ظاهیر حوکم بکا ! حەدیثی : ح-٤/٢٥٣ کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خۆی حاکم بوە ئەم ئیجتهادە بەتاڵ ئەکاتەوە ( فراجعه ) •

٣٧٢٥/٢٢ ـ عن القاسم [ بن محمد بن الصديق الأكبر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] أن امرأة من ولد جعفر [ بن أبي طالب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ـ لا جعفر الصادق ابن محمد الباقر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لانه ابن بنت محمد • رووی شیعە رەش بێ چۆن دڵیان پێ جوێن بدەن بە حەزرەتی صەدیق ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە باپیری ئیمامی مەعصوومیانە ] تخوفت أن يزوجها وليها وهي كارهة ، فأرسلت إلى شيخين من الأنصار : عبدالرحمن ، ومجمع ابني [ يزيد بن ح ـ ٥٢/٨ ] جارية [ تخبرهما أنه ليس لأحد من أمري شيء • أخرى ] قالا : فلا تخشين ، فإن خنساء بنت خِذام أنكحها أبوها وهي كارهة فرد النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ذلك ح ـ ١٠٦/١٠ ، ح ـ ٥٢/٨ وفيه : أن أباها زوجها وهي ثيب فكرهت ذلك ، فأتت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فرد نكاحه ح ـ ٥٢/٨ • وروى النسائي عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رجلا زوج ابنته وهي بكر من غير أمرها ، فأتت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ

ففرق بينهما • وأوله المجبرون على أن أباها زوجها من غير كفء [ ولكنـه تأويل من غير دليل ] قسـطلاني •

**تەرجەمە :**

قاسمی کوڕی محەمەدی کوڕی صـــەدیقی ئەکبەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ژنێ لە ئەولادی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەوە ترسا کە کەس و کاری مارەی بکەن لە یەکێك کە ئەم پێی ناخۆش بێ • هاتە لای عەبدوڕەحمان و موجەممیعی کوڕی یەزیدی کوڕی جاریە ، خەبەری دانێ کە : هیچ کەس حەقی بەسەر منەوە نیـە • وتیـان : مەترسە خەنسای کچی خیذامی ئەنصارییە باوکی بە بێ ئیذن مارەی کرد لە یەکێ ، ئەویش بێوەژن بوو ، هاتە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليـه وسلم ـ ڕەددی نیکاحەکەی کردەوە [ ئەمە حوکمی بێوەژن ] •

نەسائیی لە جابیرەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ریوایەت ئەکا کە پیاوێ کچێکی بیکری خۆیی بە بێ‌ئیذن مارەکرد لە یەکێ ، ئەو کچە هاتە خزمەت پێغـەمەر ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ پێغەمـەر ـ صـلى الله تعـالى عليـه وسـلم ـ لێـکی جـوێ‌کـردنـەوە • [ ئەمەیش حـوکمی بیـکر کـە بـە بێ ئیـذن باوکیشی مارەی ناکا لە کـەس ] تەئویلی ئـەم حەدیثە بەمە کە ئەو پیاوە ئیحتیمالی هـەیـە کـە کچەکەی لـە غەیرەکوفء مارەکردبێ •• تەئویلێکی بێ‌دەلیلە • فەرقی کچ و بێوەژن ئەوەیە بێوەژن ئەبێ بە صەریحیی بڵێ : رازیم ، کچ سکووتی دەلالەت لەسەر ڕەزا ئەکا •

**إذا كان الولي هو الخاطب(١) :**

( آثار ) موغیرەی کوڕی شوعبە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ژنێکی خزمی خۆی کە لەو لە هەموو کەس نزیکتر بوو خواست ، ئەمری کرد بە یەکێ لێی

(١) کە خوازبێنیکەر خۆی وەلی بێ ( چی ئەکا ؟ ) •

مارەکرد • عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە ئومموحەکیمی کچی قاریضی فەرموو : ئەمری نیکاحت ئەدەیتە دەست من ؟ وتی : بەڵێ • فەرمووی : وا لە خۆمم مارەکردی •

عەطا ئەفەرموێ : وەلی کە ژنێکی خزمی لە خۆی مارەکرد شاهێد بگرێ لەسەر ئەوە کە لە خۆیی مارەکرد ، یا یەکێ لە عەشیرەتی بکا بە وەکیل ئەمری پێ بکا لێی مارە بکا ح ـ ٤٩/٨ •

**نیکاحی کچ لە نیکاحی بێوەژن چاترە :**

٣٧٢٦/٢٣ ـ عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : قلت : يا رسول‌الله أرأيت لو نزلتَ واديا وفيه شجرة قد أُكِل منها ، ووجدت شجرة لم يُؤكل منها ، في أيها كنت تُرْتِع بعيرك ؟ قال : في التي لم يُرْتع منها • يعني أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لم يتزوج بكرا غيرها ح ـ ١٢/٨ •

## تەرجەمە :

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : عەرزی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـم کرد : ( يا رسول الله ) تۆ لە دۆڵێکا دابەزی درەختی لێ بێ ، بەعزێکی حەیوان لێی‌خواردبێ ، بەعزێکی لێی‌نەخواردبێ ، وشتری خۆت لە کامیانا ئەلەوەڕێنی ؟ فەرمووی : لە ناو ئەو درەختانەدا کە حەیوان لێی‌نەخواردبێ • یەعنی غەیری من کچت نەهێناوە •

فەرموودەکەی چەندە بەلیغو موقنیعە ؟ تەماشای ( مەقاماتی حەریری ) بکە دەرحەق کچو بێوە چی ئەڵێ • موراجەعەی حەدیثی جابیر کە کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ چی پێ ئەفەرموێ لە ح ـ ١١٩/٥ و لە چەند جێی ترا • ح ـ ١٣/٨ وفیه :

---

(١) دانەر ـ خ ـ ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە دانەناوە •

ما لك وللعذارى ولعابها ؟ هلا جارية تلاعبك وتلاعبها ، تضاحكك وتضاحكها !

## تەرجەمە :

بۆ کچێکت نەهێنا یاریی لەگەڵ بکەیتو یاریت لەگەڵ بکا ؟ بە دەمتەوە پێبکەنیو بە دەمیەوە پێکەنی ؟ بۆچی لە کچو ئاوی دەمی صەرفی نەظەرت کرد ؟

### موعاشەرە :

عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : لا يحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا بإذنه ، ولا تأذَنْ في بيته إلا بإذنه ، وما أنفقت نفقة من غير إمرة فانه يُؤدَّى إليه شطره ح - ٨/٩٢ ، م - ٤/٤٠٨ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : بۆ هیچ ژنێ دروست نیە کە مێردەکەی لەماڵەوە بێو بە بێ ئیذنی مێردەکەی بەرۆژوو بێ • بۆی دروست نیە بە بێ ئیذنی مێرد کەس بێنێتە ماڵەوە • بێ ئەمری مێرد هەر صەدەقەیێ بکا نیوەی ثەوابی ئەدرێتەوە بە مێردەکەی •

### ژن بۆچی یێنرێ ؟

٣٧٢٧/٢٤ - عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - عن النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : تنكح المرأة لأربع : لمالها ، ولحسبها ، وجمالها ، ولدينها ، فاظفر بذات الدين تربت يداك ! ح - ٨/٢٠ ، م - ٦/٢٥٢ ، د،ن •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرمووی : ژن لەبەر چوار شت ئەهێنرێ : لە بەر ماڵ ، لە بەر حەسەب ، لە بەر جوانیی ، لە بەر دین • ظەفەر بە صاحێب = دین = بە ، ئەگەر موخالەفە بکەی دەستت شکێ !
[ ئینسانی خەسیس بۆ ماڵی ئەهێنێ ، ئینسانی تڕزل بۆ حەسەبی یێنێ ، شەهوەتپەرست بۆ جوانیی ئەیهێنێ • ئەوی کە دینی خۆش بوێ لەبەر دینی ئەیهێنێ • ئەمە ئەعلای مەراتیبی ژن هێنانە ، موافیقی مەنطووقی قورئانە ] •

یێومژن ، ژنی منداڵدار ، خزمی نزیك ، حەننانە ، مەننانە ، ئەننانە ، ئەشقەر(1) هێنان چاك نیە مەگەر لە هێنانیانا مەصلەحەتێك بێ •

٣٧٢٨/٢٥ - عن سهل [ بن سعد الساعدي - رضي الله تعالى عنه - ] قال : مر رجل [ غني ] على رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - فقال : ماتقولون في هذا ؟ قالوا : حريٌّ إن خطب أن ينكح ، وإن شفَعَ أن يشفَّع ، وإن قال أن يُسْتَمع • قال : ثم سكت ، فمرَّ رجل من فقراء المسلمين ، فقال : ماتقولون في هذا ؟ قالوا : حريٌّ إن خطب أن لا ينكح، وإن شفع أن لا يُشَفَّع ، وإن قال أن لا يستمع • فقال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - : هذا [ الفقير ] خير من مِلْء الأرض مثل هذا [ الغني ] ح - ٢٢/٨ ، جه ، وفي الرقاق •

**تەرجەمە :**

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ :

(1) مەبەستی لەم وەصفانە ئەو ژنانەیە کە : نازو نووکەرو ، منەت بەسەرپیاوا نەرو ، ئاخ‌وئۆف‌کەرو ، بڕوبیانووگرن . دوا وەصفیش کە ( اشقر )ە مەبەست سووورهاڵو ناشیرینە .

پیاوێکی دەوڵەمەند بە لای پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رابورد ، فەرمووی : چی‌ئەڵێن لەمە ؟ عەرزیان‌کرد : لایەقە ئەگەر خوازبێنی بکا بیدەنێ ، شەفاعەت بکا لێی قەبووڵ‌بکرێ ، قسە بکا لێی ببیسترێ • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بێدەنگ بوو ، لە دوای ئەوە پیاوێکی فەقیری = موسوڵمانی = بەلادا رابورد • فەرمووی : لەمە چی ئەڵێن ؟ عەرزیان‌کرد : لایەقە ئەگەر خوازبێنی بکا نەیدرێتێ ، رجا بکا قەبووڵ نەکرێ • قسە بکا گوێی لێ‌رانەگیرێ • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : دەسا ئەم فەقیرە لە پڕ بە ئەرز لە ئەمثالی ئەم دەوڵەمەندە چاترە •

**[ ئیتر تێفکرە بۆچی ئێمە مەرحەبای فەقیر ناستێنینەوەو ، مەرحەبایان لێ ناگەین‌و ، ناچینە لایان‌و ، بێنەلامان حورمەتیان ناگرین‌و ، لەبەرمان گرانە ؟ بۆ دەوڵەمەند با لە لایان بێ‌حورمەتیش بین ئێمە هەر ئەیانپەرستین !؟ ] •**

٢٧٢٩/٢٦ ـ عن الأسود قال : سألت عائشة ـ رضي الله تعالی عنها ـ ماکان النبي ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ یصنع في بیته ؟ قالت : کان یکون في مِـهْنـَةِ [ ومحرکـة ] أهله ، فإذا حضرت الصلاة خرج إلی الصلاة ح ـ ٣٩/٢ ، ح ـ ١٩٦/٨ ، ح ـ ٣٢/٩ •

## تەرجەمە :

ئەسوەد ئەفەرموێ : لە حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ م پرسیی : کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە ماڵەوە چی ئەکرد ؟ فەرمووی : بە ئیش‌و کاری ماڵەوە مەشغووڵ ئەبوو ، کە وەختی نوێژ بهاتایە ئەچوو بۆ نوێژ •

**بەشەرتی ئیجرای عەدالەت زۆرژنهێنان سوننەتە :**

٣٧٣٠/٢٧ ـ عن سعيد بن جبير [ رحمه الله تعالى ] قال قال =لي=
ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما]: هل تزوجتَ ؟ قلت : لا • قال: فتزوج؛
فإن خير هذه الأمة وهو النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أكثرها نساء
ح ـ ٨/٨ •

**تەرجەمە :**

سەعیدی کوڕی جوبەیر ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : ئیبنوعەباس
ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لێیپرسیم : ژنت هێناوە ؟ عەرزمکرد : خەیر •
فەرمووی : ژنبێنە ؛ چونکی چاکترینی ئەم ئوممەتە [ کە پێغەمەرە ـ صلى
الله تعالى عليه وسلم ـ ] لە هەموو ئوممەتەکەی ژنی زیاتر بوە •

[ نۆ ژنی هێناوە ، دوو جارییەی بوە ] •

**چەند ژنی بێو ؟ لە شەوێکا لەگەڵ هەموویانا دروست بوون :**

٣٧٣١/٢٨ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن النبي ـ صلى الله تعالى
عليه وسلم ـ كان يتطوف على نسائه في ليلة واحدة ، وله تسع نسوة
ح ـ ٨ / ٧ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە شەوێکا تەشریفی ئەچوە لای
هەموو ئەزواجی طاهیراتی ، نۆ ژنی بوو [ لە کیتابی غوسلا ئەفەرموێ :
یانزە ژنی بوو ] دوانی جارییە بوو ، رێحانەو ، مارییە ـ رضي الله عنهن
کلهن ـ رێحانە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە پێش پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى
عليه وسلم ـ وەفاتی کرد • زەینەبی کچی خوزەیمەیشی هێنابوو لە دوای
موددەیێکی کەم ئەویش وەفاتی کرد ـ رضي الله تعالى عنها ـ دوو مانگ یا

سێ مانگی لە لا بوو • سەودەیش ـ رضي الله تعالى عنها ـ نەوبەتی خـۆی بە حەزرەتی عایشەهیبە کردبوو ، کە وابێ چوونەلایان لە شەوێکا لە پێش ئەو هیبەدا بوە •

**إفشـاء سر المرأة حرام(١) :**

٢٩/٣٧٣٢ ـ أبو سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] يقول : قـال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: إن من [ اعظم الامانة • اخرى م] أشر الناس عند الله منزلة يوم القيامة الرجل يفضي إلى امرأته وتفضي إليه ثم ينشر سـرها م ـ ٦/٢٠١ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەفەرموێ : شەڕترینی خەڵق لە دەرەجەدا لە رۆژی قیامەتا لای خوا ئەو پیاوەیە کە لەگـەڵ ژنی خۆیـا دروست ئەبێو ئەو خۆیی تەسلیم ئەکاو ، لە دواییدا یێت سیڕی ئەو ژنـە لە ناو خەڵقا بڵاو ئەکاتەوە ؛ ئەڵێ : وامانکردو وامانکرد •

**دەســـتلێدانو تەماشاکردنی ژنێ لە ژنێکی ترو بێتەوە تەعریفی بکا بۆ مێردەکەی حەرامە :**

٣٠/٣٧٣٣ ـ عبدالله [ بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ] قال : قال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم : لا تباشر المرأة المرأة فتنعتها لـزوجهـا كأنه ينظر إليهـا ح ـ ٨/١١٥ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەفەرموێ : ژن دەســـت لـە ژنێکی تر نەداو تەعریفی بکا بۆ مێردەکەی ( کـأنـە ) لـە پێش چاویەتیو تەماشای ئەکا •

---

(١) بڵاوکردنەوەی نهێنی خێزان حەرامە .

**الوصية بالنساء(١) :**

٣١/٣٧٣٤ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : إن المرأة خلقت [ كالضلع •خ ] من ضلع لن تستقيم لك على طريقة ، فإن استمتعت بها استمتعت بها وبها عِوج، وإن [ أقمتها •خ ] ذهبت تقيمها كسرتها ، وكسرها طلاقها [ ئەمە لە بوخاريیا نیە] ح ـ ٧٥/٨ ، م ـ ٢٥٨/٦ ، واللفظ لـه •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ژن لـه پەراسوێ دروستکراوه ناتوانی راستی بکەیتەوە • ئەگـەر ئیرادەت وایە لەزەتی لێبزانی هەر بە خواریی لەزەتی لێبزانە ، ئەگەر بڵێی : راستی ئەکەمەوە ئەیشکێنی ، شکانتی طەلاقدانیەتی •

٣٢/٣٧٣٥ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذي جاره، واستوصوا بالنساء خيرا ، فإنهن خلقن من ضلع ، وإن أعوج شيء في الضلع أعلاه ، فإن ذهبت تقيمه كسرته ، وإن تركته لم يزل أعوج ، فاستوصوا بالنساء خيرا ح ـ ٧٥/٨ ، م ـ ٢٥٩/٦ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەفەرموێ : ئەوی باوەڕی بـە خواو پێغەمەر هەیە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەذیەتی دراوسێی نەدا ، دەرحەقی ژنانیش تەوصیەتان بە خێر پێ ئەکەم ، تەوصیەکەم قەبووڵ بکەن ، موعامەلەی چاکەیان لەگەڵ بکەن ؛ چونکی ئەوان لە پەراسوو دروستکراون

(١) ئامۆژگاریی دەربارەی ئافرەتو خێزان .

[ یەعنی وەك پەراسوو خوارن ] لە پەراسوودا ئەوی لە هەمووی خوارتر بێ طەرەفی لای سەروویەتی ئەگەر بێنی بلێی راستی ئەکەمەوە ئەیشـــکێنی ، ئەگەر وازی لێ بێنی هەر وا بە خواریی ئەمێنێتەوە • کە وابێ دەرحەق ژنان تەوصیەم قەبووڵ بکەن ، بە چاکە لەگەڵیان رابوێرن •

[ ئیمامی غەزالیی ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : حەقی ژن بەسەر پیاوەوە ئەوەیە بە چاکی گوزەرانیان لەگەڵ بکا ، حوسنی خولقی بێ لەگەڵیـان ، حوسنی خولق لەگەڵیانا هەر ئەوە نیە کە ئەذیەتیان نـەدا ، بەڵکی ئەوەیـە تەحەمولی ئەذاو جەفایان بکا لە وەختی توورەیی‌و غەضەبیانا لـەگەڵیـــان نەرمی‌و رووخۆشیی بکا ، لەوەدا ئیقتیدا بە پێغەمەر بکا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کە ئەزواجی طاهیراتی لە قسەدا موقابەلەیان لەگـەڵ کردوە • وا بوە بەعزێکیان تا شەو تەرکیان کردوە ، فەرموویەتی : لەوە چاتر ئەوەیە کە تەحەمولی ئەذاو جەفایان زیاد بکا ، بە پێکەنین‌و صـــوحبەتی خۆش‌و گاڵتەو گەمە لەگەڵیان رابوێرێ ، ئـەوە کـــە دڵی ژنـانی پێ‌خۆش بێ ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ یاری‌و صوحبەتی لەگەڵ کردوون ، لە هەڕاکردنا موسابەقەی لەگەڵ حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعـالی عنه ـ ئەکرد ، ئەو لە پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیـە وسـلم ـ پێش‌ئەکـەوت ، دەفعەیێ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لێی پێش‌کەوت فەرمووی : ئەمە بەوە ، یەعنی ئەم پێشکەوتنەم بەو پێشکەوتنەت • قەسطەلانی •

٣٢/٣٧٣٦ ـ وعنه قال ـ قال رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ: لا یَفْرَكْ مؤمن مؤمنة ، إن كرِه منها خلقـا رضي منها آخـر ، أو قـــال غـيره م ـ ٦/٢٥٩ •

**تەرجەمە :**

هیچ پیاوێکی موسوڵمان هیچ ژنێکی موسوڵمان بە ئەذیەتدان هەڵنەپروێنێ ئەگەر لە خولقێکی نارازیی بێ لە خولقێکی تری رازیی ئەبێ •

**دەوڵەتی چاکی دنیا ژنە :**

٣٧٣٧/٣٤ ـ عن عبدالله بن عمر [ رضي الله تعالى عنه ] أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : الدنيا متاع وخير متاع الدنيا المرأة الصالحة م ـ ٦/٢٦١ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : دنیا مەتاعە ، چاترینی مەتاعی دنیا ژنی صالحە •

**ژن فیتنەیە :**

٣٧٣٨/٣٥ ـ عن أسامة بن زيد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : ماتركت بعدي فتنة أضر على الرجال من النساء ح ـ ٨/٢٤ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لە دوای خۆم فیتنەیێکم بەجێنەهێشت کە لە هەموو فیتنەیێ زەرەری زۆرتر بێ بۆ پیاو لە ژن [ چونکی تەکلیفی وای لێ ئەکا پیاوەکە مەجبوور ئەکا بە طەلەبی حەرام ( مەئەلا ) ] •

**خوازبێنی حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ :**

٣٧٣٩/٣٦ ـ عن عروة أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خطب عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] إلى أبي بكر [ رضي الله تعالى عنه ] فقال =له=

أبو بكر [ رضي الله تعالى عنه ] : إنما أنا أخوك • فقال : أنت أخي في دين الله وكتابه ، وهي لي حلال ح ـ ٨/١٤ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خوازبێنی حەزرەتی صەدیقەی لە حەزرەتی صەدیقی ئەکبەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کرد • حەزرەتی صەدیق ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : من برای تۆم [ یەعنی برازا بۆ مام چۆن ئەبێ ؟ ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : تۆ برامی لە دینا و لە کیتابوڵلاّدا [ إنما المؤمنون إخوة ] ئەو بۆ من حەلاّڵە •

[ ئەم حەدیثە مورسەلە ؛ چونکی عوروە تابیعییە ، ئەمما عوروە کوڕی ئەسمایە ، ئەویش حەزرەتی عایشەی دیوە ، لەوانی بیستوە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ] •

**گاڵتەو صوحبەت لەگەڵ ژنا زۆر چاك نیە :**

٣٧/٣٧٤٠ ـ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كنا نتقي الكلام والانبساط إلى نسائنا على عهد النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ هيبةً أن ينزل فينا شيء ، فلما تُوفّي النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تكلمنا وانبسطنا ح ـ ٨/٧٦ ، جه •

## تەرجەمە :

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لە زەمانی پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خۆمان ئەپاراست لەوە کە قسەو گاڵتەو یاریی لەگەڵ ژنەکانمان = بکەین = لەوە ئەترساین کە دەرحەقمان قورئان نازڵ بێو لێمان حەرام بکا • کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەفاتی

فەرموو لە دوای ئەوە دەستمان کرد بە یاریی و صوحبەت و قسەی خۆش لەگەڵیان ، لە بەر تەوصیە بە نیساء •

**هیبەکردنی خۆی بە پێغەمبەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ :**

٣٨/٣٧٤١ ـ عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : كنت أغار على اللاتي وهبن أنفسهن لرسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وأقول : وتهب المرأة نفسها ؟ فلما أنزل الله ـ عز وجل ـ: ( ترجي من تشاء منهن ، وتؤوي إليك من تشاء ، ومن ابتغيت ممن عزلت )[1] قالت : قلت : والله ما أرى ربك إلا يسارع في هواك م ـ ٦/٢٥٠ ، ح ـ ٨/٣٩ •

٣٩/٣٧٤٢ ـ عروة قال : كانت خولة بنت حكيم ـ رضي الله تعالى عنها ـ من اللائي وهبن أنفسهن للنبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقالت عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ أما تستحي المرأة أن تهب نفسها للرجل [بغير صداق • رواية ابن سيرين ] فلما نزلت : ( ترجي من تشاء منهن ••• ) قلت: يا رسول الله ما أرى ربك إلا يسارع في هواك ح ـ ٨/٣٩ ، م ـ ٦/٢٥٠ •

( مرسل ) ثابت البناني [ رحمه الله تعالى ] قال : كنت عند أنس [رضي الله تعالى عنه ] وعنده ابنة له [ أُمَيَنة ] قال أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ: جاءت امرأة إلى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تعرض عليه نفسها • قالت : يا رسول الله أَلكَ بي حاجة ؟ فقالت بنت أنس : ما أقل حياءها ؟ واسوأتاه ! واسوأتاه ! قال : هي خير منك ، رغبت في النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فعرضت عليه نفسها ح ـ ٨/٤٢ •

---

(١) الاحـــزاب / ٥١ •

**تەرجەمە :**

ئەم سێ حەدیثە یەك حادیثەیە مەئالیان ئەمەیە :

خەولەی کچی حەکیم لـە دوای وەفـاتی عوثمانی کـوڕی مەظعوون ـ رضي الله تعالى عنهما ـ یێتە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خۆی هیبە ئەکا بە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حەزرەتی عایشـە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : ژن حەیا ناکا لەوە خۆی بە بێ مارەیی هیبە بکا بە پیاو ؟ لەوە زۆر غیرەت ئەیگرتم تا ئایەتی سوورەتی ئەحـزاب نازڵ بوو کە ئەفەرموێ : ( يا أيها النبي ) : ئەی پێغەمەر ( إنا أحللنا لك ) : ئێمە بۆ تۆمان حەلاڵکرد ( أزواجك اللاتي آتيت أجورهن ) : ئەو ژنانـەت کە مارەییت داونێ ( وما ملكت يمينك مما أفاء الله عليك ) : ئەو ژنانەیش کە بوون بە مولکی تۆ لەو جارییانەی کە خوا بەخشیویەتی بـە تـۆ ( وبنـات عمك ) : کچانی ئامۆزایشتو ( وبنات عماتك ) : کچانی خوشـکی باوکتو ( وبنات خالك ) : کچانی خاڵتو ( وبنات خالاتك ) : کچانی پووری دایکیت ( اللاتي هاجرن معك ) : ئەوانەی کە هیجرەتیان کردوە لەگەڵ تۆدا ، گینـا بۆت حەلاڵ نین • ( وامرأة مؤمنة ) : ئەو ژنـە موسوڵمانەیش ( إن وهبت نفسها للنبي ) : کە نەفسی خۆی هیبە ئەکا بە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ( إن أراد النبي أن يستنكحها ) : ئەگەر پێغەمەر نیازی مارەکردنی ئەوی بێ • ( خالصة لك من دون المؤمنين ) : هیبەکردنی ژن نەفسی خۆی بە تۆ هەر مەخصووصـە بە تۆوە بۆ موئمینی تر نیـە ( قد علمنا ) : ئێمە علیمان هەیە ( ما فرضنا ) : بەوی فەرزمان کردوە لـە ســـــەریان ( في أزواجهم ) : دەرحەقی ژنیان (وما ملكت أيمانهم) :=هەروەها=ئەو جارییانەی کە بوون بە مالیکیان لە شەرائیطی عەقدی نیـکاحی حوڕەو تـەمەللوکی جارییە ، بۆیێکمان هیبەی ژن تەخصیص‌کردوە بە تۆوە • ( لـكيلا يكون

عليك حرج ) : تا هەرچی کە تۆ بیکەی حەرەجت لەسەر نەبێ ، خوا ئیش بۆ تۆ واسیع ئەکا ( وكان الله غفوراً رحيما ) : خوا غەفوورو رەحیمە لەوەی کە ئیحتیراز لێ‌کردنی زەحمەت‌بێ •

( ترجي من تشاء منهن ) : لەو ژنانە کامی ئارەزووتە تەرکی ئەکەی‌و ( وتؤوي إليك من تشاء ) : کامی ئارەزووتە ئەیگریتە لای خۆت • ( ومن ابتغيت ) : ئەوەیش کە طەلەبی ئەکەی ( ممن عزلت ) : لەوانە کە لە خۆت دوورخستۆتەوەو قسمەتی لەگەڵ ناکەی ، یا بە طەلاٚقی ریجعیی طەلاٚقت داون ( فلا جناح عليك ) : لەم موعامەلانەی کە ئەیکەی هیچ گوناهت لەسەر نیە ( ذلك ) : ئەم تەفویضە ( أدنى ) : نزیکترە ( أن تقر أعينهن ) : بەوەی کە چاویان پێی روون بێتەوە ( ولا يحزنّ ) : مەحزوون نەبن بەو موعامەلەی تۆ ئەیکەیت‌و ( ويرضين ) : رازیی بین ( بما ) : بەوەی ( آتيتهن ) : کە ئەیان‌دەیتێ ( كلهن ) : هەموویان • یەعنی لێیان مەعلووم بێ کە تۆ موخەییەری لەو موعامەلەدا کە لەگەڵیان ئەکەی ، ئارەزووت بێ ئەیان‌دەیتێ ، ئەچیە لایان ، ئارەزووت بێ نایان‌دەیتێ ، ناچیە لایان • بزانن کە ئەوە بە ئەمری خوایە دڵ موطمەئین بین ( والله يعلم ما في قلوبكم ) : خوا عالمە بەوەی لە دڵتانایە ( وكان الله عليماً حليما ) : خوا عیلمی بوەو هەیە بەوەی لە دڵتانایەو حەلیمە کە گورج عەزابتان نادا ، ئەزانێ کە بەعزێکتانی لە بەعزێکتان زیاتر خۆشەوێ •

خوا لە دوای ئەم ئایەتە بۆ تەلطیفی دڵی ئەزواجی طاهیرات مەنعی پێغەمەری کرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە طەلاٚقدانیانو ژن‌بەسەرهێنانیان کە لە ئایەتەکەی دواوەدا ئەیفەرموو •

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : عەرزی پێغەمەرم کرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : ( يا رسول الله ) وا ئەبینم کە

رەببی تۆ ـ عز وجل ـ هەر عەجەلە لە تەحصیلی رەزاو ئارەزووی تۆدا ئەفەرموێ •

کە ئەبوهورەیرەیش ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم حەدیثە ریوایەت ئەکا ئومەینەی کچی لە خزمەتیا ئەبێ ئەڵێ : ئای شەرمەندە خۆم ! ئای شەرمەندە خۆم ! ئەو ژنە چ ژنێکی بێشەرم بوە خۆی هیبەکردوە • ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی ئەفەرموو : ئەو ژنە لە تۆ چاتر بوە کە رەغبەتی پێغەمەری بوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نەفسی خۆیی عەرضی پێغەمەر کردوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ •

**غیرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ :**

٣٧٤٣/٤٠ ـ أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عند بعض نسائه [ عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ] فأرسلت إحدى أمهات المؤمنين [ لم تعلم ] بصحفة فيها طعام • فضربت التي النبيُّ في بيتها يد الخادم فسقطت الصحفة فانفلقت ، فجمع النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فِلَقَ الصحفة ، ثم جعل يجمع فيها الطعام الذي كان في الصحفة ويقول : غارت أمكم ، ثم حبس الخادمَ حتى أُتِيَ بصحفة من عند التي هو في بيتها ، فدفع الصحفة الصحيحة إلى التي كسرت صحفتها ، وأمسك المكسورة في بيت التي كسرت فيه خ ـ ١٠٧/٨ ، ح ـ ٢٦٩/٤ • أحمد ، ن ، د •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی لە لای حەزرەتی عایشە بوو ـ رضي الله تعالى عنها ـ یەکێ لە ئەزواجی لە تەبەقێکا طەعامی بۆ نارد • حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە دەستی کارەکەرەکەی دا،

تەبەقەکەی لە دەست کەوتە خوارێو شکا ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پارچەکانی کۆکردەوەو طەعامەکەی کردەناوی فەرمووی : دایکتان غیرەتی هەڵساوە • لە پاشا خادیمەکەی بەندکرد تەبەقێکی ســــاغی لای عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ وە هێنــا ناردی بۆ ئەوەی تـەبـەقـەکـەی شکابوو ، تەبەقە شکاوەکەی لـەو مـالـەدا گلدایەوە کە تەبەقەکەی تیـا شکابوو •

**غیرەتی زوبەیرو ئەسما ـ رضي الله تعالى عنهما ـ:**

٤١/٣٧٤٤ ـ عن أسماء بنت أبي بكر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قالت : تزوجني الزبير وما له في الأرض من مال ، ولا مملوك ، ولا شيء غير ناضح [ وشترێ کـە ئـاوی لە بیر پێ هەڵەهێنجن ] وغير فرسـه • وكنت أعلف فرسه ، وأستقي الماء ، وأخرز غَرْبه [ دلوه ] وأعجن • ولم أكن اُحْسِن أخبز • وكان يخبز جارات لي من الأنصار ، وكن نسوة صدق • وكنت أنقل النوى من أرض الزبير التي أقطعه رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ على رأسي ، وهي مني على ثلثي فرسخ ؛ فجئت يوما والنوى على رأسـي فلقيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ومعه نفر من الأنصار فدعاني، ثم قال : إخ ، إخ ، ليحملني خلفه ، فاستحييت أن أسير مع الرجال ، وذكرت الزبير وغيرته ، وكان أغير الناس ، فعرف رسول الله ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ أني قد استحييت فمضى ، فجئت الزبير ، فقلت : لقيني رسـول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وعلى رأسي النوى ومعه نفر من أصحابه ، فأناخ لأركب ، فاستحييت منه ، وعرفت غيرتك • فقال : والله لحملكِ النوى =كان= أشد علي من ركوبكِ معه • قالت [ ولم أزل أخدم ] حتى أرسل إلي أبو بكر [ رضي الله تعالى عنه ] بعد ذلك بخادم يكفيني سياسة الفـرس فكأنما أعتقني ح ـ ٨/١٠٦ ، م ـ ٩/٢ ن م / ٦ في النكاح •

## تەرجەمە :

ئەسمای کچی ئەبوبەکر – رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : زوبەیر مارەی‌کردم ، لەسەر ئەرز غەیری ئەو وشترەی ئاوی لە بیر پێ هەڵئەیێنجاو ، غەیری ئەسپەکەی هیچ ماڵو غولامی نەبوو • ئاڵفم ئەدا بە ئەســپەکەی ، ئاوم هەڵەهێنجا ، دۆلکەی بیرەکەم ئەدوورووەوە ، هەویرم ئەشـــــێلا ، نەمئەزانی نان بکەم ، چەند ژنێکی دراوسێی باش‌و راســـتمان بوو نــە ئەنصار ئەوان نانیان بۆ ئەکردم • بـە سـەر دەنکی خورمام لـــەو ئەرزی زوبەیرەوە کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە ئەموالی بەنی‌نەضیر دابووی بە زوبەیر = ئەهێنایەوە = ئەو ئەرزەی لە مەســـکەنی منەوە دوو بەش لە سێ‌بەشی فرسەخێ دوور بوو [ یەعنی چل دەقیقە ] رۆژێ هاتمەوە دەنکە خورماکەم بەسەر سەرەوە بوو ، لە رێ بە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ گەییم چەند کەسێکی لە ئەنصار لە خزمەتا بوو ، بانگی‌کردم ، لە دوایيا فەرمووی : ئیخ ، ئیخ • کە وشترەکەی بیخ بداو لە پشـــــت خۆیەوە سوارم کا ، شەرمم کرد کە لەگەڵ پیاوانا بڕۆم ، فکری زوبەیـرو غیرەتی ئەویشم کردەوە کە بە غیرەتترینی هـەموو پیـاوان بوو ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرقی بەوە کرد کە شەرم ئەکەم تەشــریفی لێی‌دا رۆیی ، ئەوەم بۆ زوبەیر گێڕایەوە ، فەرمووی : وەڵلاهی ئەوەم لـــە لاخۆشتر بوو کە لە خزمەتیا سوار بی لەوە کە دەنکە خورماکەت بەســەر سەرەوە بێ • ئەوەم لا گرانتر بوو کە دەنکە خورماکەت بەسەر سەرەوە بێ لەوەی کـە لـە خزمەتیا ســـوار بی [ ئەوە عاری تیا نیـە دەنکەخورمـا هەڵگرتنەکەت عاری تیایە ] ئەسما ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : هەر بەو نەوعە خزمەتم کرد تا ئەبوبەکر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ خادیمێکی بـۆ ناردم سەییسی ئەسپەکەی لە کۆڵ خستم وەکوو ئازادی کردبم وابوو •

ژن بۆ ماڵو مێردی خزمەت بکا لە حوسنی موعاشەرەیە •

شەرم لە پیاوی نامەحرەم لە حوقووقی مێردە کە بەسەر ژنەوە هەیەتی • نامەحرەم ئەوانە بوون کە لە خزمەتیا بوون گینا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە هەموو ئوممەتی خۆی مەحرەم بوە[1] •

**إفتخار الضرة[2] :**

٣٧٤٥/٤٢ ـ عن أسماء ـ رضي الله تعالى عنها ـ أن امرأة [ نفسها ] قالت : يا رسول الله إن لي ضرة فهل علي جناح إن تشبعت من زوجي غير الذي يعطيني ؟ [ وعن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ أن امرأة قالت : يارسول الله أقول : إن زوجي أعطاني مالم يعطني ••• الخ] فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : المتشبع بمالم يعط كلابس ثوبي زور ـ ح ـ ١٠٤/٨، م ـ ٤٤١/٨ •

## تەرجەمە :

ئەسما ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : ژنێ [ کە خۆیەتی ] عەرزی پێغەمەری کرد ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ : ( یا رسول الله ) هەوێیێکم هەیە [ ئومموکولثوومی کچی عەقەبەی کوڕی ئەبوموعەیط ] گوناهم ئەگاتێ کە لە خوصووصی مێردەکەمەوە لای هەوێکم خۆم هەڵبکێشم ؛ بڵێم : مێردەکەم ئەوەی داومێ کە نەیدابمێ ؟ پێغەمەر ـ صلی

(١) ئەم باسەی ئەسماو زوبەیر لە ل : ٢٩٦ی بەرگی چوارەمدا وەك ئەم دەقەی ئێرە رابورد . لە دەقی عەرەبییەکەی حەدیثەکەدا لەوێ دوو هەڵەی چاپ هەیە . لە دوو دێری دوایی ل : ٦٩٦دا لە باتی ( اخرز ) ( اغرز ) نووسراوە . لە دوای ( أحسن )وە ( أخبز ) کەوتوە .

(٢) خۆهەڵکێشانی هەوێ ( هەوێ ساریی ) .

الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : هەرکەسێ خۆی هەڵبکێشێ بە شتێك کە نەیدرابێتێ وەکوو کەسێکە کە دوو لیباسی درۆزنی لەبەرکردبێ •

**في الغيرة :**

٣٧٤٦/٤٣ - وعنها قالت : كنت أخدم الزبير خدمة البيت ، وكان له فرس وكنت أسوسه ، فلم يكن من الخدمة شيء أشد علي من سياسة الفرس ، كنت أحتش له وأقوم عليه وأسوسه قال [ ابن أبي مليكة ] ثم إنها أصابت خادما جاء النبيَّ - صلى الله تعالى عليه وسلم - سبي فأعطاها خادما ، قالت: كفتني سياسةالفرس فألقتعنيمؤنته، فجاءنيرجل،فقال: يا أم عبدالله إني رجل فقير أردت أن أبيع في ظل دارك • قالت : إني إن رخصت لك أبى ذلك الزبيرُ ، فتعال فاطلب إليَّ والزبير شاهد • فجاء فقال : يا أم عبدالله إني رجل فقير أردت أن أبيع في ظل دارك • فقالت : مالك بالمدينة إلا داري؟ فقال لها الزبير : ما لك أن تمنعي رجلا فقيرا يبيع ؟ فكان يبيع إلي أن كسب فبعتُهُ الجارية ، فدخل عليَّ الزبير وثمنها في حجري • فقال : هبيها لي • فقالت : إني قد تصدقت بها م - ٦/٩ •

## تەرجەمە :

ئەسما - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : خزمەتی زوبەیرم ئـەکرد - رضي الله تعالى عنه - ئەسپێکی بوو سەییسی ئەسپەکەم ئەکرد ، هیچ شتێ نەبوو لە سەییسێتی ئەسپەکە بۆم بە زەحمەتتربێ • جێم بۆ چا ئـەکـرد ، بەسەریەوە ئەوەستام ، سەییسیم ئەکرد • لە پاشا بۆ پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - ئەسیر هاتبوو ، جاریەیەکی دایێ ، ئەو جاریە سەییسی ئەسپەکەی ، لە کۆڵ خستم • پیاوێ هاتەلام وتی : پیاوێکی فەقیرم بێڵە کە لە بن سێبەری خانوەکەتا شت بفرۆشم • وتم : ئەگەر ئیذنت بدەم زوبەیر نایێڵێ • کە وەختێ زوبەیرم لابێ وەرە طەڵەبی ئەوەم لێ بکە • لەو وەختەدا

هات وتی : ئەی دایکی عەبدوڵلا من پیاوێکی فەقیرم بێڵە لە بن سێبەری خانوەکەتا شت بفرۆشم • وتم : لە مەدینەدا غەیری ماڵی ئێمەت نەدۆزیوەتەوە ؟! زوبەیر پێیوتم : بۆچی پیاوێکی فەقیر مەنع ئەکەی کە لەبەر سێبەری خانوەکەتا شت بفرۆشێ ؟ شتی لێ فرۆت ، تا شتێکی پەیدا کرد ، جارییەکەم پێفرۆت ، زوبەیر هاتەوە پارەکەم لە کۆشا بوو ، وتی : پێم هیبە بکە ، وتم : کردوومە بە صەدەقە •

لا نكاح إلا بولي لقول الله ـ عز وجل ـ ( فلا تعضلوهن ••• )[1] فدخل فيه الثيب وكذلك البكر • وقال : ( ولا تنكحوا المشركين حتى يؤمنوا )[2] وقال ( وأنكحوا الأيامى منكم •••)[3] •

## تەرجەمە :

لەم خوصووصەوە نە لە بوخاریدا نە لە موسلیما حەدیثێ نیە ، بە موختەصەریی شەرحی قەسطەلانی لێرەدا تەرجەمە ئەکەم •

بوخاریی ئەفەرموێ : بە وەلیی نەبێ نیکاح دروست نیە ؛ چونکی خوا لە سوورەتی ( البقرە )دا ئەفەرموێ : کە ژنانتان تەلاقداو عیددەیان رابورد مەنعیان مەکەن لەوە کە شوو بکەنەوە بە مێردەکانیان بە رەزای خۆیان •

ئیمامی شافیعیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەم ئایەتە صەریحترینی دەلیلێکە دائیر بەمە کە نیکاح وەلی پێ ئەوێ • ئەگەر وەلی پێ نەوێ بۆ مەنعکردنیان مەعنای نابێ ؛ چونکی کە موحتاج نەبێ بە وەلی

(١) البقـرة / ٢٣٢ •
(٢) البقـرة / ٢٢١ •
(٣) النـور / ٣٢ •

وەلییەکەی رازیی بێو نەبێ ئەتوانێ شوو بکا • ئەمما ئەبێ بە دوشمنی • ئەیشفەرموێ : مەنعیان مەکەن کە خۆیان شوو بکەنەوە بە مێردەکانیان •

**[ ئەمە وا ناگەیێنێ کە لە وەختی عەقدا وەلی لازمە • وا ئەگەیێنێ ( بالذات ) خۆی ئەتوانێ عەقد بکا • رەشید ] •**

بەیهەقی لە کیتابی مەعریفەتا ئەفەرموێ : کەسێ ئەمری پێ ئەکرێ [ مەممنووعە ؛ چونکی کەسێکیش ئەمری پێ ئەکرێ کە بە جەبرو زۆری خۆی بە ناحەق ، یا لەبەر شیربایی مەنعی بکا • دەلالەتیش ناکا کە عەقدبێ وەلیی دروست نابێ •رەشید] بەمە کە مومانەعەت لە نیکاح نەکا کە دەخلێکی بێ لە مەنعکردنا لە نیکاح بەو تەواو بێ • ئەم ئایەتە ظاهیرترینی دەلیلێکە لە قورئانا کە وەلی حەقی موداخەلەی لە ژنا هەیەو لە سەری لازمە کە ژن رەزای بوو کە لە ( کوفء ) بە مەهری میثل نیکاحی خۆی بکا مەنعی نەکا لە نیکاح • بوخاریی ئەفەرموێ : لە مەنعنەکردنا کچو بێوەژن بەرئەکەون ، خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : بێوەژنتان بدەن بە شوو [ خیطابی خوا ـ عز وجل ـ لەگەڵ پیاوایە ، خیطابی لەگەڵ ژنا نەکردوە ، کە وابێ هیچ ژنێ ، نە خۆی نە غەیری خۆی لەکەس نیکاح ناکا ، نە بە ویلایەت نە بە وەکالەت ؛ چونکی لایەق نیە بە مەحاسینی عادات کە ژن بێ بە ئەرکانی نیکاح لە ئەمرو نەهیا ] • ئیبنوماجەهـ بە مەرفووعیی حەدیثێ ریوایەت ئەکا کە : ژن ـ ژن نیکاح ناکاو خۆیشی نیکاح ناکا •

بوخاریی حوکمی لازمبوونی وەلی لە ئایاتو ئەحادیثی تر ئیستیخراج کردوە ، حەدیثی صەریحی نەهێناوە • وەك ئەو حەدیثەی کە ئەبوداوودو تیرمذییو ئیبنوماجەهـ ریوایەتیان کردوە لە ئەبوموسوسەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە ئەفەرموێ : هەر ژنێ بێ وەلی خۆی نیکاح بکا لە یەکێكو

موجامەعەی لەگەڵا بکرێ هیچ حاکمێ حوکم نەکا نە بە صیحجەتی نە بە بوطلانی ، مەهری میثل لازمە ( مسمی )[1] لازم نیە ؛ چونکە فاسیدە •

تیرمذییو ئیبنوحیببانو حاکم حەدیثێکیان ریوایەتکردوە • تیرمذیی ئەفەرموێ : حەسەنە • ئەوانی تر ئەڵێن : صەحیحە ، حەدیثەکە ئەمەیە : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەفەرموێ :

« أيما امرأة نكحت نفسها بغير إذن وليها ، فنكاحها باطل ( ثلاثا ) ، فإن دخل بها فلها المهر بما استحل من فرجها »

## تەرجەمە :

هەر ژنێ بە بێ ئیذنی وەلیی خۆی نیکاح بکا نیکاحەکەی باطیلە ، باطیلە ، باطیلە • ئەگەر پێوەکردبێ بە سەبەبی ئەوەوە کە فەرجی ژنەکەی بۆ خۆی حەڵاڵکردوە ، یەعنی وەك حەڵاڵ تەصەڕوفی کردوە ، مەهری میثلی بۆ هەیە • نە ئەو ژنە حەددی لەسەرە نە ئەوی مارەیکردوە ؛ چونکی ئیختیلافی عولەما لە دروستبوونو نەبوونیا هەیە منالەکەیش نەسەبی صەحیح ئەبێ ، واریثو مەورووث[2] ئەبێ لە دایکیشو لە باوکیشی• ئەمما ئەگەر موعتەقیدی تەحریمی بێ وەك موقەللیدی شافیعیی تەعزیر ئەکرێ حەددی لەسەر نیەو کەفارەتیشی نیە •

ئەبوحەنیفە ئەڵێ : ئەگەر حوڕڕی عاقڵی بالغ مارەی خۆی لە یەکێ بڕی ، یا کەسێکی کرد بە وەکیل ، یا خۆی بوو بە وەکیلی ژنێ کە لە یەکێکی مارە بکا نیکاحی بێ وەلیی جائیزە •

---

(١) واتە : ئەو مارەییە کە دیاریکراوەو ناوبراوە •

(٢) واتە ئەو منالەی لەو عەقدە پەیدا ئەبێ میراتیش ئەگرێو میراتیشی لێ ئەگیرێ •

ئەبویوسف دەفعەیێ وتوویەتی : ئەگەر وەلیی ببێ بێ وەلیی دروست نیە ، لە پاشا لەوە پەشیمان بوەتەوەو وتوویەتی : ئەگەر شوو بە کوفء بکا بێ وەلیی دروستە ، کوفء نەبێ دروست نیە ، لەوەیش پەشیمان بوەتەوە وتوویەتی : بێ وەلیی شوو بە کوفئو غەیری کوفء بکا دروستە ●

محەمەد ئەڵێ : نیکاحی ( بلا ولي ) مەوقووفەتە سەر ئیجازەی وەلیی ، مێردەکەی کوفء بێ یا غەیری کوفء بێ ● ئەمیش گەڕاوەتەوە سەر قەولی ئەبوحەنیفە ●

دەلیلی دروستبوونی نیکاحی ( بلا ولي ) ئەمەیە خوا - عز وجل - لە سێ ئایەتا نیکاحی ئیسناد داوەتە ئەلای ژن ● فەرموویەتی : گوناهتان لەسەر نیە لەوەدا ژنان دەرحەقی نەفسی خۆیان ئەیکەن ● فەرموویەتی : مەنعی ژنان مەکەن کە شوو بکەنەوە بە مێردەکانیان ● فەرموویەتی ، دەرحەقی نیکاح بەجاش : بۆی نیە ژنەکەی خۆی کە سێبەسێ طەلاق دابێ تا شوو بە پیاوێکی تر نەکا بێنێ مارەی بکاتەوە ● ئەم سێ ئایەتە صەریحن لەوەدا کە نیکاح بە عیبارەتی ژن دروست ئەبێ ؛ چونکی لەم ئایەتانەدا تەصریح کراوە کە نیکاح لە طەرەف ژنانەوە واقیع بوە ●

ئەوی ئەڵێ کە بە ژن پێك نایێ رەددی ئەم نەصصانەی کردۆتەوە ● حەدیثی بێوەژن ئەحەقە بە نەفسی خۆی لە وەلییەکەی بە ئیتتیفاقی ( محدثين ) صەحیحە ● مەعنای ( فلا تعضلوهن ) ئەمەیە ئەفەرموێ : مەنعی ژنان مەکەن لەمە کە ( بالذات ) خۆیان لە یەکێ مارە بکەن ● یەعنی موداخەلەیان مەکەن خۆیان سەربەستن ● حاڵ وایە بوخاریش ئەڵێ : لە بابی نیکاحی ژنو کچا حەدیثێکی صەحیح نیە کە دەلالەت بکا لەسەر ئیشتیراطی وەلیی ● یەعنی حەدیثی « أيما امرأة ••• » صەحیح نیە ● ( بالفرض والتقدير ) صەحیح بێ مەحموولەتە سەر جارییەو مناڵ ●

( القسطلاني • راجع الجمع الجوامع في التأويل البعيد وما قالـه فـي هـذا الحـديث ) •

**سەبەبی نوزوولی ( فلا تعضلوهن ) :**

٣٧٤٧/٤٤ ـ حەسەنی بەصریی ـ رحمه الله تعالى ـ له تەفسـیری ( فلا تعضلوهن )دا ئەفەرموێ : مەعقەلی کوڕی یەسار ـ رضي الله تعـالى عنه ـ قسەی بۆ کردم کە ئەم ئایەتە دەرحەقی ئەو نازڵ بوە : ئەفـەرموێ : خوشکێکم بوو لە پیاوێکم نیکاح کرد ، تەڵاقی دا ، تـا عیـددەی چوو • هات دیسان خوازبێنی کرد• پێموت: لێم مارەکردی کردم‌بە ژنت، ئیکرامم گرتی تەڵاقت‌داو ئێستە هاتووی خوازبێنی ئەکەی ؟ خەیر وەڵلا ( أبديـا ) نایێتەوە لات • ئەو پیاوەیش خراپ نەبوو ، ژنەکەیشی حەزی ئەکرد بچێتەوە لای • خوا ئەم ئایەتەی نازڵ فەرموو • ئەو وەختە عەرزی پێغەمەرم کـرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : ( يا رسول الله ) ئەمجا لێی نیکاح بکە ، لێی مارەکردەوە ح ـ ٤٩/٨ •

ئەم حەدیثەیش صـەریحە لەمەدا کـە وەلیی پێ ئەوێ ، ئەگەر پێی نەویستایە چ حاجەت ئەبوو بـە ئیذنی براکەی ؟ ئیبنومونذیر ئەفەرموێ : هیچ صـــــەحابەیێ نازانم کـە خیلافی ئەمەی لێ ریوایەت کرابێ • قەسطەلانی •

**نیکاحی زەمانی جاهیلییەت :**

٣٧٤٨/٤٥ ـ عوروەی کوڕی زوبـەیر ـ رضـي الله تعـالى عنـه ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ خەبەری داوێ کە لە زەمانی جاهیلییەتا چوار نەوع نیکاح بوە :

١ ـ ئەم نیکاحەیە کە ئێستە هەیە کە پیاو خوازێنێ کچو خوشكو ئامۆزاو برازاو سائیری ( مولیــه )ی کەسێکی تر ئەکا ، مارەیی ئــەداتیو نیکــاحی ئــەکــا •

٢ ـ ژنەکەی خــۆی وەك مایین لە پیاوێکی نەجیب چاك ئەکا : کــە ژنەکــەی لــە حەیز پاك بۆوە پێی ئەڵێ : بنێرە لای فلانکەس بێ لەگەڵتــا دروست بێ • کە لەگەڵیا دروست بوو ، مێردەکەی خۆی ناچێ بە لایــەوە تــا لەو پیاوە حامیلە ئەبێ • کە لێی مەعلووم بوو لەو پیاوە ئاوس‌بوە ئەمجا خۆی ئەچێتە لای ژنەکەی ، بۆیە ئەم ( دیوث )ییە ئەکا حەزەکا کە ژنەکەی منالێکی نەجیبی ببێ ! بەم نیکاحە ئەڵێن نیکاحی ( استبضاع ) •

٣ ـ لە دە کەمتر ، چەند پیاوێ لە سەر ژنێ کۆئەبنەوە هەموویــان یەك لــە دوای یەك لەو ژنە ئەپەڕن ، کــــە ئاوس بوو لەوانەو وەضـــعی حەملی‌کرد ، چەند شەوێکی بەسەرا رابورد ئەنێرێتە لای ئەوانەی کــە لێی پەڕیون بانگیان ئەکا ، هیچ پیاوێکیان ناتوانێ کــە خۆی بگرێتو نەچێ • کە لە لای کۆبوونەوە پێیان ئەڵێ : خۆتان ئەزانن کـــە لەگەڵما چیتـــان کردوە ، وا ئێستە کە زاوم • ژنەکە حەز لە کامیان بکا بــەوە ئــەڵێ : ئەی فلان ئەم منالە منالی تۆیە • منالەکە ئەبێ بە منالی ئەو ! ئەو پیاوە کە ژنەکە تەعیینی کردوەو ناوی بردوە ناتوانێ کە منالەکە قەبوول نەکا •

٤ ـ فاحیشەی عادەتین ؛ هەموو کەسێ کە ئارەزووی بێنێ ئەچێتــە لای ئەو فاحیشەیە لەگەڵیا دروست ئەبێ • ئەو ژنە هەرکەسێ بچێ داوای لێ بکا مومانەعەت ناکا خۆی تەسلیم ئەکا ، کە حــامیلە بــوو ئــەوانــە کۆئەکرێنەوە کە لەگەڵیا دروست بوون قائیف بانگ‌ئەکرێ ئەو قائیفە منالەکە ئیلحاق ئەکا بە یەکێ لەوانە ئەبێ بە منالی ئەو کەسە • ئــەو پیاوە ناتوانێ

مومانەعەت لە باوکێتی بکا ! کە پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - بە پێغەمەرێتی نێررا غەیری ئەم نیکاحەی کە ئێستە هەیە هەدمی کرد لە بنچینەی هێنانە دەرێ ح - ٨/٤٧ •

**نیکاحی موتعە - صیغەکردن :**

٣٧٤٩/٤٦ - عن علي بن أبي طالب [ رضي الله تعالى عنه ] أنه سمع ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] يُليِّنُ في متعة النساء • فقال : مهلا يا ابن عباس فإن رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - نهى عنها يوم خيبر وعن [ أكل • خ ] لحوم الحمر الإنسية م - ٦/١٣٧ ، ١٣٦ ، ح-٨/٤١ ليس فيه إلى : فإن رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - •

## تەرجەمە :

ئیمامی عەلی لە ئیبنوعەباسی بیست کە لە نیکاحی موتعەی ژنانا سوهوولەت ئەنوێنێ پێیفەرموو : ئەی ئیبنوعەباس واز بێنە چونکی پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - لە رۆژی خەیبەرا نەهی لە صیغەو خواردنی گۆشتی کەری ماڵیی کردوە •

ئەمە نابێ بە حوججەت لەسەر ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنه - چونکی مەنسووخە بە ئیذندانی پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - بە موتعەکردن لە فەتحی مەککەدا •

٣٧٥٠/٤٧ - عن جابر بن عبدالله وسلمة بن الأكوع [ رضي الله تعالى عنهم ] قالا : كنا في جيش [ أوطاس ] فأتانا رسول رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - فقال : إنه قد أُذِنَ لكم أن تستمتعوا فاستمتعوا ح - ٨/٤٣ م - ٦/١٢٩ •

**تەرجەمە :**

جابیری کوڕی عەبدوڵلاو سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەفەرموون : لە لەشکرێکا بووین فروستادەی رەسوولوڵلا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ هاتەلامان فەرمووی : ئیذندراون کە نیکاحی موتعە بکەن ، ئەوانیش کردیان •

٣٧٥١/٤٨ ـ وعن سلمة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: أيما رجل وامرأة توافقا فعِشْرةُ ما بينهما ثلاث ليالٍ، فإن أحبا أن يتزايدا [ تزايدا ] أو يتتاركا تتاركا [ أو ان يتناقصا تناقصا ] فما أدري أشيء كان لنا خاصة أم للناس عامة ؟ قال أبو عبدالله : وبينه عليٌ [ رضي الله تعالى عنه ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنه منسوخ ح ـ ٨/٤٢ •

**تەرجەمە :**

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : هەر پیاوو ژنێ موافەقەتی یەکتریان کرد لە نیکاحا بێ ذیکری موددەت ، عوشرەتی مابەینیان سێ شەوە ؛ ئەگەر هەوەسیان بێتێ لێی کەمکەن یا لێی زیادکەن ، یا یەکتری تەرکەکەن •• بیکەن • سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : نازانم ئەمە شتێکە هەر بۆ ئێمە کە صەحابەین یا بۆ هەموو خەڵقە ؟ [ دیارە بۆ هەموو خەڵق بوە ؛ چونکی لەفظەکەی عامە ئەفەرموێ : هەر ژنو پیاوێ ] •

بوخاریی ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەیانی ئەوەی کردوە کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ

وما هو يا رسول الله ؟ فتلا عليها هذه الآية • قالت : أفيك يا رســـول الله أستشير أبوي ؟ بل أختار الله ورسوله والدار الآخرة ، وأسألك أن لا تخبر امرأة من نسائك بالذي قلت • قال : لا تسألني امرأة منهن إلا أخبرتها ، إن الله تعالى لم يبعثني معنتا ولا متعنتا ، ولكن بعثني معلما ميسرًا م-٦/٢٨٧ •

## تەرجەمە :

جابیری کوڕی عەبـدوڵلا ـ رضي الله تعـــالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ هات ئیذنی خواست کە بچێتە خـزمـەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســـلم ـ خەڵقی دی کە لەبەر دەرگاکەدا دانیشتبوون بۆ هیچ کەسێکیان ئیذن نەدرابوو بچێتە خزمەتی ، ئەبـوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیذندرا ، لەپاشا عومەر ـ رضي الله تعالى عنــه ـ هات ئیذنی خواست ، ئیذندرا چوەژووروێ خزمەتی ، تێفکری پێغەمــەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی دانیشتبوو ، ژنەکانی لـــە دەوری بوون ، زۆر مەحزوون بوو ، بێدەنگ تەشریفی دانیشتبوو • عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : شتێك ئەڵێم پێغەمەر ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ بێنێتەپێکەنین • عەرزی‌کرد : ( یا رسول الله ) کچی خاریجەت ببینیایە داوای نەفەقەی لێ‌کردم ، لێی هەڵسام‌و کێشام بە ملیا ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێکەنی ، فەرمووی : ئەوان وان لە دەورم داوای نەفەقـــەم لێ ئەکەن • ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هەڵسا دەستی کرد بە پیاکێشانی ملی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ عومەر ـ رضي الله تعــالى عنه ـ تەشریفی هەڵسا کێشای بە ملی حەفصەدا ـ رضي الله تعــالى عنهــا ـ هەردوکیان ئەیانفەرموو : داوای شتێك لە پێغەمەر ئەکەن ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کە نەیبێ ؟! وتیان : وەڵلاهی قەت داوای شتێکی لێ‌ناکەیــن کە نەیبێ • لە پاشا پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ مانگێ یا بیست‌و

تۆ رۆژ [ شك الراوي ] تەرکیکردن • لە پاشا ئەم ئایەتی سوورەتی ئەحزابە نازڵ بوو کە مەئالی شەریفی وایە : ئەی پێغەمەر بە ژنەکانت بڵێ : ئەگەر ئێوە حەیاتی دنیاو زینەتی دنیاتان ئەوێ بێن مارەیی‌یەکەتان بدەمێو بە تەلاقێکی جوانو بێزەرەر تەلاقتان بدەم، ئەگەر خواو رەسووڵی خواو ماڵی ئاخیرەتتان ئەوێ [ کە بەهەشتە ] بە تەحقیق خوا ـ عز وجل ـ لە ئێوە بۆ ئەوانەی کە موحسینێو ئاخیرەتیان ئەوێ ئەجرێکی گەورەی بۆ حازرکردوون [ کە نەعیمی موقیمی بەهەشتە • یەعنی موختار بن ئینتیخابی دنیاو تەلاق ئەکەن ، یا ئاخیرەت ؟ ] کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە عایشەوە ـ رضي الله تعالی عنها ـ دەستی پێکرد ؛ فەرمووی : ئەی عایشە تەمامە شتێکت پێ بڵێم وام ئەوێ تا پرس بە دایكو باوکت نەکەی عەجەلەی تیا نەکەی • عەرزیکرد : ئەوە چیە ( یا رسول الله)؟ ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە • عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : ( یا رسول الله) دەرحەق تۆ مەشۆرەت بە دایکمو باوکم بکەم؟ من خواو رەسووڵی خواو داری ئاخیرەت ئیختیار ئەکەم [بەسەر دنیاو زینەتیا] شتێکم لێت ئەوێ کە خەبەر نەدەی بە ژنەکانت کە چیم عەرزکردووی • فەرمووی : هیچ ژنێکیان نیە کە لێم بپرسنو پێی نەڵێم ؛ چونکی خوا منی وا نەناردوە کە ( بالطبع ) لەوانە بم کە ئیش بە گران بگرم ، یا بە تەکەللوف وا لە خۆم کەم کە ئیش قورسو گران کەم ، خوا منی بە موعەللیمو ئیش بە سووکیگر ناردوە •

سوننەتە ئینسان کەسێکی خۆشەویستی بە زیریو ماتیی ببینێ قسەیێکی وای بۆ بکا کە پێی دڵفەرەح بێ ؛ حوزنەکەی لابەرێ • ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ وای نەکرد تەفویضی ئەو ئەمرەی بە خواو ریسالەتپەناە کرد •

تەربیەی ئەولاد ـ با گەورەیش بێ ، با خوصووص دەرحەق بە گەورەو سەردار ـ سوننەتە •

نەفەقە لە مێرد بە قەد تاقەت طەلەب ئەکرێ ، صەبر لەسەر شیددەتو تەنگانە مووجیبی ئەجرێکی عەظیمە •

١١٥/٣٨٣٨ ـ عەبدوڵلای کوڕی عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : عومەری کوڕی خەطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قسەی بۆ کردووم کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ژنەکانی تەرككرد ، چوومە مزگەوت ، خەڵق لە مزگەوتا وردەبەردی مزگەوتەکەیان ئەدا بە یەکاو[1] ئەیانوت : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ژنەکانی خۆی تەڵاق داوە • ئەوە لە پێش نوزوولی حیجابا بوو • عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : وتم : ئیمڕۆ من تەحقیقی ئەمە ئەکەم • چوومە لای عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ پێموت : ئەی کچی ئەبوبەکر تۆ وات لێ هاتوە کە ئەذیەتی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بدەی ؟ وتی : ئەی ئیبنولخەطاب چ دەخڵێکمان هەیە بەسەر یەکەوە ؟ بچۆ نەصیحەتی کچەکەی خۆت بکە ! لە حەدیثی م ـ ٦/٢٩٢ و ح ـ ٧/٣٧٦دا ئەفەرموێ : عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە لای حەفصە چوومە دەرێ تا چوومە لای ئومموسەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ چونکی دایکیان ئامۆزا بوو ، قسەم لەگەڵکرد ، فەرمووی : عەجایب بۆ تۆ ئەی ئیبنولخەطاب موداخەلەی ئیشی هەموو کەسێ ئەکەی حەتتا وات ئەوێ کە موداخەلەی ئیشی پێغەمەر ـ صلى‌الله‌تعالى‌عليه‌وسلم ـ و ئەزواجی بکەی!؟ ئەو قسەی ئوممسەلەمەوای تەئثیر تێکردم کە بەعزێ لەو قەهرو غەزەبەی کە بووم لێم کەم بووەو لە لای چوومە دەرێ ] •

(١) واتە : وردەبەردەکانیان ئەمدیوو ئەودیو ئەکردو ئەیان‌دان بە یەکا ، نەك بەسەرو گوێلاکی یەکا •

چوومه لای حەفصەی کچی عومەر پێموت : ئەی حەفصە گەییوی بەو مەرتەبەیە کە ئەذیەتی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دەی ؟

وەڵلاهی ئەزانم کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تۆی خۆش ناوێ ، ئەگەر من نەبم تەڵاقت ئەدا • بەوە حەفصە زۆر بە شیددەت گریا پێموت : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی لە کوێیە ؟ وتی : تەشریفی لە گەنجینەکەدایە • چوومە ژوورێ ، رەباحی غولامی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە بەردەرگای گەنجینەکەی دانیشتبوو پێی بەسەر پلەی پەیژەکەدا کە لە دارێ بوو جێی پێی لێ‌هەڵکەنرابوو پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی پێی سەرەکەوت‌و پیا ئەهاتەخوارێ =دانابوو= بانگی رەباحم کرد کە لە خزمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئیذنم بۆ بخوازە • رەباح تەماشایێکی گەنجینەکەی کردو تەماشایێکی منی کردو قسەی نەکرد • دووبارە پێموتەوە دیسان وای کرد، لە پاشا بە دەنگێکی بەرز وتم : ئەی رەباح ئیذنم لە خزمەتیا بۆ بخوازە لاموایە کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لای وایە کە لەبەر حەفصە هاتوومە خزمەتی • وەڵلاهی ئەگەر ئەمرم پێ بفەرموێ لە گەردنی بدەم لە گەردنی ئەدەم ! بەوە دەنگم هەڵبڕی ، رەباح ئیشارەتی کردمێ کە سەرکەوێ ، چوومە خزمەتی لەسەر حەسیرێ راکشابوو ، دانیشتم ئیزارەکەی دابوو بە خۆیا هیچی تری بەسەرەوە نەبوو،حەسیرەکە جێ‌شوێنی لە تەنیشتی کردبوو ، تەماشای گەنجینەکەیم کرد بە قەد صاعێ جۆی تیا بوو ، نەختێ گەڵای داری مۆردی تیابوو کە دەباغی پێ ئەکرێ، پێستێکی دەباغ‌نەکراوی تیا هەڵاوەسرابوو • گریانم هات فەرمووی : ئەی ئیبنی‌خەطاب بۆ ئەگریت ؟ عەرزمکرد : ( یا رسول الله ) بۆ نەگریم ئەم حەصیرە نەقشی کردۆتە تەنیشتت ، ئەمە خەزێنەی تۆیە هیچی تیا نابینم

ئەمە نەبێ کە ئەیبینم • ئەوەیش قەیصەرو کیسران کە =لە= ناو میوەو ئەنهاران ، تۆیش پێغەمەری خوای و مونتەخەبی خوای ئەمەیش خەزێنەکەتە! فەرمووی : ئەی ئیبنولخەطاب رازیی نابی بەوە کە ئێمە ئاخیرەتمان بێتو ئەوان دنیایان بێ ؟ عەرزم‌کرد : بەڵێ • عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : لە وەختێکا کە چوومە خزمەتی لە رووی موبارەکیا نیشانەی غەزەبم دی ، عەرزم‌کرد : ( یا رسول الله ) ئیشی ژنانت بۆ لەبەر گرانە ؟ ئەگەر تەلاقیان بدەی خوا لەگەڵ تۆیە ، مەلائیکەی خواو جیبریل‌و میکائیل‌و من‌و ئەبوبەکرو موسوڵمانان لەگەڵ تۆین • حەمدی خوا ئەکەم کە هەر جارێ قسەیێکم کردبێت‌و ئومێدم نەبووبێ کە خوا تەصدیقی قسەکەم بکا•[1] [ وەڵلاهی راستی فەرموە ، وەڵلاهی هیچ قسەیێکی‌و ئیجتیهادێکی نیە کە تیا بە خەطا چووبێ • وەڵلاهی چۆن فەرموودەی پێغەمەر وەحیە فەرموودەی حەزرەتی فاررووقی ئەکبەریش هەمووی ئیلهامی ئیلاهیە ] •

ئەفەرموێ : ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە ئایەتی تەخییرەو ئەفەرموێ : ئەگەر پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - ئێوە تەلاق بدا نزیکە کە خوا ئەزواجی لە ئێوە چاتری بداتێ لە باتی ئێوە • ئەگەر ئێوە لە ( علیه ) ئەو قسە بکەن بە یەك‌و بن بە پشتیوانی یەك بە تەحقیق خوا ناصرو مەولای ئەوە ، جیبریل‌و موسوڵمانی صالح یاریەدەری ئەون ، دوای ئەوانیش مەلائیکە پشتیوانی ئەون • عایشەی کچی ئەبوبەکرو حەفصە - رضي الله تعالی عنهما - پشتیان دابوە پشتی یەك لە ( علیه ) ژنەکانی تری • عەرزم‌کرد:

---

(١) دانەر لە پێشدا نووسیویە : « حەمدی خوا ئەکەم کەم جار = هەیە = قسەیێکم کردبێت‌و ... تاد » بەڵام دوایی خۆی بە قەڵەم وەك ئەوەی سەرەوەی لێ کردوە ، بەڵام هەر وەك کۆنەکە بێ راستە .

( يا رسول الله ) تەڵاقت‌داون ؟ فەرمووی : خەیر • عەرزم‌کرد : ( یا رسول الله ) کە هاتمە مزگەوت موسوڵمانان دەستیان لە بەردەوردەی مزگەوتەوە ئەداو ئەیان‌وت : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ژنەکانی تەڵاق‌داوە، بچمە خوارێ‌و خەبەریان بدەمێ کە ژنەکانت تەڵاق نەداوە ؟ فەرمووی : بەڵێ • هەروا قسەم عەرزکرد تا غەزەب لە رووی موبارەکی لاچوو ، تا ددانی موبارەکی دەرخست‌و پێکەنی ، ددانی موبارەکی لە ددانی هەموو کەس جوانتر بوو •

لە پاشا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی چوە خوارێ، منیش چوومە خوارێ ، کەچوومەخوارێ دەستم بە دارەکەوە ئەگرت ، ئەو وا تەشریفی چوە خوارێ وەك بەسەر ئەرزا بڕوا دەستی بە دارەکەوە نەئەگرت • عەرزم‌کرد : ( یا رسول الله ) هەر بیست‌و نۆ رۆژ تەشریفت لە گەنجینەکەدا بوو ؟ فەرمووی : مانگ بیست‌ونۆ رۆژ ئەبی [ ئەومانگە بیست‌و نۆ رۆژ بوو • اخری ] لە بەر دەرگی مزگەوتەکە راوەستام بەدەنگی بەرز بانگم‌کرد کە : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ژنەکانی تەڵاق نەداوە • ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە مەئالی وایە :

( وإذا جاءهم أمر من الأمن أو الخوف )[1]: کە دائیر بە ئەمینیی یا بە ترس خەبەرێکیان درایێ لە ناو خەڵقا بڵاوی ئەکەنەوە • ئەگەر ئەو خەبەرە رەد بکەنەوە بۆ لای پێغەمەر یا بۆ لای ( أولو الأمر ) ئەوانەی کە لە رەسوول‌و ( أولو الأمر ) ئیستینباط‌و تەلەققی ئەکەن تێی‌ئەگەن کە حەقیقەتەکەی چۆنە • من لەوانە بووم کە ئیستینباطم لە رەسوولوڵلا کرد خوا ـ عز وجل ـ ئایەتی تەخییری نارد [ یەعنی خەڵق بیستبوویان کە

(١) النساء / ٨٣ •

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ژنەکانی تەڵاق‌داوە تیی نەگەییبوون کە هەر مانگێ تەرکی کردبوون ، من تا لە خۆییم نەپرسـی بڕوام پێ نەکردو شایعەم پێ نەدا ، کە حەقیقەتەکەم بە ئەنجام گەیان خەبەرم دا ] م-٦-٢٨٩/٠
٣٨٣٩/١١٦ ـ عەبدوڵلای کوڕی عەبـاس ـ رضـي الله تعـالى عنهمـا ـ ئەفەرموێ : ساڵێ وەستام ئیرادەم بوو کە لە عومەری بنی خەطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ بپرسم لە ئایەتێ ، هەیبەتم لێ ئەکرد نەموێرا لێی بپرسم ، تا تەشریفی لە مەدینە چوەدەرێ بۆ حەج ، لە خزمەتیا چـووم کـە تـەشریفـی گەڕایەوە لە رێگەییێکا [ مر الظهران • كما في أخرى ] بووین چوو بۆ ناو دار سیواکەکان بۆ قەزای حاجەت ، راوەستام تا لێ‌بۆوە ، لە خزمەتیا رۆییم عەرزم‌کرد : ( يا أمير المؤمنين ) ئـەو ژنانە کێن کە لـە ( عليه )ی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قسەیان کردبوو بە یەك ؟ فەرمووی : حەفصەو عایشەن ئیبنو عەباس ـرضي‌اللہ‌تعالى‌عنهماـ ئەفەرموێ: عەرزم‌کرد: وەڵلاهی ساڵێکە تەمامە ئەمەت لێ بپرسم لەبەر ئەمە هەیبەتت لێ ئەکەم ناتوانم لێت بپرسم! فەرمووی: وا مەکە، هەرچیت لا وا بێ کە من علمم پێی هەبە لێم بپرسە، ئەگەر بیزانم خەبەرت ئەدەمێ•فەرمووی:وەڵلاهی ئێمە لە جاهیلییەتا ژنانمان بە هیچ حسێب ئەکرد ، لامان بێ قیمەت بوون ، تـا خـــوا لـــە دەرحەقیان ئەوی کە ئینزالی فەرموو فەرمووی [ کە ئەفەرموێ : (وعاشروهن بالمعروف) : بە چاکیی موعاشەرەتیان لەگەڵ بکەن ] ئەوی بۆی تەقســیم کردبوون تەقسیمی کرد [ لە ئایەتی رەضاعا ئەفەرموێ : لەسەر ئەوەی کە منالەکەی بۆ بە وەڵەد هێنراوە رزق‌و لیباسی دایکی منالەکە هەیە ] تا وەختێ تەدبیرم لە ئیشێکا ئـەکـرد ژنەکــەم پێی‌وتم : ئەگـەر وات بکردایـەو وات‌بکردایە ! پێم‌وت : تۆ دەخلت چیە بەسەر ئەم ئیشەوە ؟ لـ ە هیـــچ ئیشێکا کە ئەیکەم من تەکلیفی هیچ ئیشێکت لێ ناکەم • پێی‌وتم: عەجایبم

لێت ئەمێنێ ئەی ئیبنولخەطاب ناتەوێو پێت ناخۆشە کە لە قسەدا موقابەلەت بکەم کەچی کچەکەت بەرەوڕووی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەوەستێ ، وا ئەبێ ئەو ڕۆژە لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وە بە غەزەبو قەهر ڕائەبوورێ ؟! بەرماڵەکەم هەڵگرت چوومە دەرێ تا چوومە لای حەفصە پێموت : ئەی کچی خۆم هیچ بەرەوڕووی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەوەستی ئەویش ئەو ڕۆژەی بە قەهرەوە لێ بەسەر ئەچێ ؟ وتی : وەڵلاهی ئێمە ئاوا موقابەلەی ئەکەین • وتم : بزانە کە من تەحذیرت ئەکەم لەمە کە خوا موعاقەبەت بکا ، ڕەسوولی ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ غەزەبت لێ بگرێ • بەوە مەغروو مەبە کە ئەوی جوانیەکەی پێغەمەری ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ خستۆتە ئەو حاڵەوە کە خۆشی بوێو مەحەبەتی چەسپیوەتە دڵی •

لە پاشا چوومە لای ئومموسەلەمە ؛ چونکی خزمایەتیم لەگەڵیا هەیە [ دایکیان ئامۆزان ] قسەم لەگەڵ کرد • وتی : عەجایەب لە تۆ ئەی ئیبنولخەطاب خۆت ئەخزێنیە هەموو شتێکەوە حەتتا ئەتەوێ بچیە بەینی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ و ئەزواجی ؟! عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : وای تەئثیر تێکردمو شکانمی لەو حاڵەی کە بووم لێی چوومەدەرێ [ لە حەدیثەکەی ترا ئەفەرموێ : چوومە لای عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ] لای ئومموسەلەمە چوومە دەرێ ڕەفیقێکم لە ئەنصار بوو کە غائیب بوومایە لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەو خەبەرێی بۆ ئەهێنام ، ئەو حازری نەبوایە من خەبەرم بۆ ئەبرد ، ئێمەیش لەو وەختەدا ترسمان لە مەلیکێ لە مولووکی غەسسان بوو ، سنگمان لە ترسیان پڕ بووبوو ، ڕۆژێ هاتەوە دای لە دەرگاکە وتی : بیکەرەوە ، بیکەرەوە • وتم : بۆ غەسسانیەکە هاتوە وتی : لەوە خراپتر :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لە ژنەکانی جوێبوەتەوە • وتم : لووتی حەفصەو عایشە لە خاك نیشێ ! لە دواییـدا جلەکەم هەڵگرتو چوومەدەرێ تا چوومە ئەوێ ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسـلم ـ تەشریفی لە گەنجینەیێکا بوو بە پێپیلکە بۆی سەرەکەوترا ، غولامێکی رەشی لەسەر دانیشتبوو ، پێموت : ئـەمە عومەرە [ لـە دوای چەند موراجەعە ، کما في ما مر ] ئیذندرام • عومەر ـ رضي الله تـعالى عنه ـ فەرمووی : ئەم قسانەم عەرزی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کرد کە گەییمە سەر قسەی ئوممو سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ تەبەسسومی کرد ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی لەسەر حەسـیرێ بـوو لە بەینی ئەوو حەسیرەکەدا هیچی تر نەبوو ، سەرینێکی چەرمی لە ژوور سەرابوو پووشی دارخورمای تێ ئاخنرابوو ، لای پێیەوە کـۆمەڵێ گەڵای داری ( سلم )ی لێ بوو کە دەباغی پێ ئەکەن ، لە ژوور سـەریەوە پێستێکی دەباغ‌نەکراو هەڵاوەسرابوو ، تێفکریم حەسیرەکە لە تەنیشتی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەئثیری کردبوو ، گریام • فەرمووی: بۆ ئەگریت ؟ عەرزم‌کرد : ( یا رسول الله ) کیسراو قەیصەر لەوەدان کـە تیایان [ یەعنی لـە نازو نیعمەتان ] تۆیش رەسوولوڵڵای ـ صلى الله تعالى عليـه وسـلم ـ ! فەرمووی : بـۆ رازیی نیت کە ئەوان دنیایان بێو تۆ ئاخیرەت ؟ م ـ ٦/٢٩٢ • لە حەدیثی م ـ ٦ /٢٩٥ ا ئەفەرموێ : ئەو دوو ژنە حەفصەو ئوممو سەلەمەن ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حەدیثێکی ترم لـە عیلما نووسیوە م ـ ٦/٢٩٨ ،لە حەدیثی م ـ ٦/٢٨٤ دا لە ئاخریا عەرزم‌کرد: من خـواو رەسـوولی خـواو داری ئـاخیرەتم ئـەوێ • خ ـ ٤/٢٦٠ ، ح ـ ٧/٣٧٦ •

سائیری ئەزواجی پێغەمەریش ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ، ورضي عنهن ـ وەك منیان عەرزکرد • لە موسلیمو بوخاریدا دەرحەق ئەم حادیثەیە حەدیثی تر زۆرە ، مەئالیان یەکێکە ئەوەندە کافیە ( راجع النووي م ـ ٦/٢٧٨ في حكم الإيلاء وتحريم ما أحل الله ، وما بعده في أحكام الإيلاء ) •

**لا نفقة ولا سكنى للمطلقة البائنة(١) :**

١١٧/٣٨٤٠ ـ عن فاطمة بنت القيس أن أبا عمرو بن حفص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ طلقها البتة [ ثلاثا • أخرى م ] وهو غائب فأرسل إليها وكيله بشعير فسخطته فقال : والله ما لكِ علينا من شيء • فجاءت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فذكرت ذلك له ، فقال : ليس لكِ عليه نفقة • فأمرها أن تعتد في بيت أم شريك • ثم قال : تلكِ امرأة يغشاها أصحابي ، اعتدي عند ابن أم مكتوم ، فإنه رجل أعمى تضعين ثيابكِ ، فإذا حللت فأذنيني• قالت : فلما =حللت= ذكرت له أن معاوية بن أبي سفيان وأبا جهم = رضي الله تعالى عنه = خطباني ، فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: أما أبو جهم فلا يضع عصاه عن عاتقه ، وأما معاوية فصعلوك لا مال له [•••••] أنكحي أسامة بن زيد ، فكرهته [ فقالت بيدها هكذا : أسامة ، أسامة ! فقال لها رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : طاعة الله وطاعة رسوله خير لكِ • أخرى •م] ثم قال : أنكحي أسامة ، فنكحته فجعل الله فيه خيرا واغْتَبِطْتُ م ـ ٦/٣٠٤ •

وفي أخرى : فتزوجته ، فشرفني الله بأبي زيد ، وكرمني الله بأبي زيد م ـ ٦/٣٠٢ ، م ـ ٦/٣٠٤ •

---

(١) ژنێك كە تەلاق بدرێ بە تەلاقی بائینە ـ واتە تەلاقێ كە گەڕانەوەی تیا نەبێ ـ نەفەقەو جێی دانیشتنی لەسەر مێردە پێشوەكەی نیە .

١١٨/٣٨٤١ ـ عن عبيد الله بن عبدالله بن عتبة أن أبا عمرو بن حفص بن المغيرة خرج مع علي بن أبي طالب [ رضي الله تعالى عنهم ] إلى اليمن ، فأرسل إلى امرأته فاطمة بنت قيس بتطليقة كانت بقيت من طلاقها ، وأمر لها الحرث بن هشام وعياش بن أبي ربيعة [ رضي الله تعالى عنهما ] بنفقة فقالا لها : والله ما لك نفقة إلا أن تكوني حاملا • فأتت النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فذكرت له قولهما • فقال : لا نفقة لك ، فاستأذنته في الانتقال ، فأذن لها • فقالت : أين يا رسول الله ؟ فقال : إلى ابن أم مكتوم ، وكان أعمى، تضع ثيابها عنده ولا يراها • فلما مضت عدتها أنكحها النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أسامة بن زيد ، فأرسل إليها مروان قبيصة بن ذؤيب يسألها عن الحديث فحدثته به ، فقال مروان : لم يسمع هذا الحديث إلا من امرأة سنأخذ بالعصمة التي وجدنا الناس عليها • فقالت فاطمة ـ رضي الله تعالى عنها ـ حين بلغها قول مروان : فبيني وبينكم القرآن ، قال الله تعالى : ( لا تخرجوهن من بيوتهن ••• الآية )[١] قالت : هذا لمن كانت له مراجعة ، فأي أمر يحدث بعد الثلاث ؟ فكيف تقولون : لا نفقة لها إذا لم تكن حاملا ؟ فعلام تحبسونها ؟ م ـ ٦/٣١٢ •

**تەرجەمە :**

ئەبوعەمری کوڕی حەفص فاطیمەی کچی قەیسی ( غیابا ) تـەڵاق دا بە تەڵاقی قەطعیی ، لە ریوایەتێکا سێبەسێ ، ئەبوعـەمر بە وەکیلـەکەیا جۆی بۆ نارد فاطیمە رقی هەڵسـا ، وەکیلەکەی پێیوت : وەللاهی هیـچ حەقت لەسەر ئێمە نیە • فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ هاتـە خـزمـەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەوەی عـەرزکـرد ، فـەرمـووی : نەفەقەت لەسەری نیە • ئەمری پێفەرموو عیددە هـەڵژمێرێ لـە ماڵی

(١) الطـلاق / ١ •

ئوmموشورەیکا ، لە دواییا فەرمووی : ئوmموشورەیك ژنێکە ئـەصحابی منی زۆر ئەچنە لا ، لای ئیبنوئوmمی مەکتووم عیددە هەڵژمێرێ چـونکی پیاوێکی ئەعمایە جلت دائەکەنی [ یەعنی ناتبینێ ] کە شووکردنت بۆ حەڵاڵ بوو خەبەرم بدەرێ • کە خەبەرم دایێ کە موعاویــەو ئـەبوجەهـم داوام ئەکەن ، فەرمووی : ئەبو جەهم عەصای لەسەر شان دانانێ [ یەعنـی زۆر لە ژن ئەدا ] ئەمما موعاویەیش زوگوردەو ماڵی نیە ، شوو بکە بە ئوسامەی کوڕی زەید • پێی ناخۆش بوو عەرزیکرد : ئوسامە ، ئوسامە ؟ دەستی هەڵتەکان • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ئیطاعـەی خواو رەسوولی خوا بۆ تۆ باشە شووم پێکرد خوا خێری دامێو غیبطـەم پێخورا • لە ریوایەتێکی ترا فەرمووی : شووم بە ئوسامە کرد ، خوا بە ئەبوزەید موشەڕەفی کردم ، بە ئەبوزەید موکەڕەمی کردم •

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە ئەفەرموێ : ئـەبـو عەمری کوڕی حەفصی کوڕی موغیرە لە خزمەت عـەلي بنـی ئەبـە طالیبا ـ رضي الله تعالی عنهم ـ چوو بۆ یەمەن فاطیمەی ژنی تەڵاقێکی مابـوو ئەو تەڵاقەی داو ، خەبەری بۆ نارد ئەمری بە حەرثی کوڕی هیشامو عەیاشـی کوڕی ئەبوڕەبیعە ـ رضي الله تعالی عنهما ـ کرد نەفەقەی بدەنێ ، پێیانوت: وەڵڵاهـی نـەفـەقـەت نیە مـەگــەر حامیلـە بی • هـــاتەخزمـــەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ قســـــەی ئەوانەی عـەرزکـرد • پێیفەرموو : نەفەقەت نیە ، ئیذنی لێخواست لەوێ بچێتەدەرێ [ئیذنی دا] فەرمووی : بۆ کوێ ؟ فەرمووی : بۆ ماڵی ئیبنوئوmمی مەکتووم، پیاوێکی ئەعما بوو ، لای جلی داکەنێ نایبینێ • کە عیددەکەی رابورد پێغەمـــەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە ئوسامەی کوڕی زەیدی مارەکرد • مەروان قەبیصەی کوڕی ذوئەیبی ناردە لا کە ئەو حەدیثەی لێ بپرسێ ، قسەکەی

بە مەروان وت • مەروان وتی : ئەم حەدیثە لە غەیری ژنێ نەبیسراوە • [ یەعنی موعتەبەر نیە • ئەمما نینۆکی ئەو ژنە صەد هەزارانی وەکوو مەروانی بەصەدەقە بێ ] بەو حوکمەی کە خەڵقی لەسەر ئەبینین عەمەل ئەکەین • فاطیمە - رضي الله تعالى عنها - کە ئەو قسەی مەروانەی پێگەییەوە فەرمووی : قورئانمان لە بەینا هەیە ؛ خوا - عز وجل - لە سوورەتی تەحریما ئەفەرموێ : لە مەسکەنەکانیان مەیانکەنە دەرێ ؛ خۆیشیان نەچنە دەرێ ، ئەو ئەحکامە حودوودی خوایە کە تەعیینی کردوە تەجاوزی لێ نەکرێ ، هەرکەسێ لە حودوودی خوا بچێتەدەرێ بە تەحقیق ئەو کەسە زوڵم لە خۆی ئەکا خۆی موستەحەقی عەذاب ئەکا • ئەی ئەو کەسەی کە ئەمرت پێئەکرێ نازانی بەڵکو لە دوای ئەوە کە ژنەکانتان تەلاق دا خوا شتێکی ترتان بۆ ئیحداث ئەکا [ بەڵکی پەشیمان ئەبنەوە لە تەلاقدان روجووعیان ئەکەنەوە ژێر نیکاحتان ، بۆیە مەیانکەنە دەرێو خۆیشیان نەچنە دەرێ ] ئەو وەختە =یا= بە چاکیی ئیمساکیان بکەنو بیانهێننەوە ژێر نیکاحتان ، یا بە چاکیی لێیان جوێبنەوەو زەرەریان پێمەگەیێنن ••• الآیة •

١١٩/٣٨٤٢ - عن أبي إسحاق قال : كنت مع الأسود بن يزيد جالسا في المسجد الأعظم ومعنا الشعبي ، فحدث الشعبي بحديث فاطمة بنت قيس أن رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - لم يجعل لها سكنى ولا نفقة ، ثم أخذ الأسود كفا من حصى فحصبه به ، فقال : ويلك تحدث بمثل هذا ؟ قال عمر [ رضي الله تعالى عنه ] : لا نترك كتاب الله وسنة نبينا - صلى الله تعالى عليه وسلم - لقول امرأة لا ندري لعلها حفظت أو نسيت ! لها السكنى

والنفقة • قال الله ـ عز وجل ـ : ( لا تخرجوهن من بيوتهن ولا يخرجن إلا أن يأتين بفاحشة مبينة )[1] م ـ ٦/٣١٥ •

١٢٠/٣٨٤٣ ـ وعن فاطمة بنت قيس [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : قلت يا رسول الله طلقني زوجي ثلاثا وأخاف أن يقتحم علي قال [ عروة ] : فأمرها فتحولت م ـ ٦/٣١٨ •

١٢١/٣٨٤٤ ـ وعن عروة : عابت عائشة [ رضي الله تعالى عنها ـ فاطمة رضي الله تعالى عنها ] أشد العيب وقالت : إن فاطمة كانت في مكان وحش ، فخيف على ناحيتها فلذلك أرخص لها النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ح ـ ٨/١٧٦ •

١٢٢/٣٨٤٥ ـ وعنها أنها قالت : ما لفاطمة ألا تتقي الله ؟ يعني في قوله: لا سكنى ولا نفقة ح ـ ٨/١٧٦ ، م ـ ٦/٣١٨ •

١٢٣/٣٨٤٦ ـ عن القاسم بن محمد وسليمان بن يسار [ رحمهم الله تعالى ] يذكران أن يحيى بن سعيد بن العاص طلق بنت عبدالرحمن بن الحكم، فانتقلها عبدالرحمن فأرسلت عائشة أم المؤمنين إلى مروان ، وهو أمير المدينة : اتق الله واردها إلى بيتها ، قال مروان في حديث سليمان : إن عبدالرحمن بن الحكم غلبني • وقال القاسم بن محمد [ رحمهما الله تعالى ]: أوَ ما بلغك شأن فاطمة بنت قيس ؟ قالت : لا يضرك أن لا تذكر حديث فاطمة • فقال مروان : إن كان بكِ شر فحسبك ما بين هذين من الشر ح ـ ٨/١٧٥ •

**تەرجەمە :**

ئەبوئیسحاق ـ رحمه الله ـ ئەفەرمووێ : لە مزگەوتی گەورەدا لەگەڵ

---

(١) الطلاق / ١ .

ئەسوەدی کوڕی یەزید دانیشتبووم شەعبیشمان لەلا بوو ، شەعبیی حەدیثی فاطیمەی کچی قەیسی ریوایەت کرد کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ سوکناو نەفەقەی بۆ واجب نەکردبوو • لە پاشا ئەسوەد مستێ وردەبەردی هەڵگرت هاویتی بۆ شەعبیی پێی فەرموو : هێلکت بڕێ تۆ ئەم نەوعە حەدیثە ریوایەت ئەکەی ؟ عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئێمە کیتابوڵلاو سونەتی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەرك ناکەین بە قسەی ژنێ کە نازانین سوکناو نەفەقەی حیفظ کردوە یا لە فکری چۆتەوە[1]؟ خوا عز وجل ـ ئەفەرموێ : موطەللەقە ئیشێکی زۆر فەحش و قەبیحی لێ صادر نەبێ لە جێی خۆیان کە تیابوون مەیانکەنە دەرێ و خۆیشیان نەچنەدەرێ • فاطیمەی کچی قەیس ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : عەرزی پێغەمەرم کرد ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ : ( یا رسول الله ) مێردەکەم سێ‌بەسێ تەلاقی داوم ئەترسم هوجومم بکرێتەسەر • عوروە ئەفەرموێ ـ لە فاطیمەوە ـ : ئەو وەختە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەمری پێ فەرموو بە گوێزانەوەی •

عوروە ئەفەرموێ : عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ عەیبێکی قورسی لە فاطیمەگرت ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : فاطیمە لە جێیێکی تەنهاو بەترسا بوو ، لە ئەطرافی ترسی بوو بۆیە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئیذنی دا بگوێزێتەوە • عایشە ئەفەرموێ : چی‌رووی داوە لە فاطیمە تەقوا لە خوا ناکا ؟ یەعنی کە ئەڵێ سوکناو نەفەقە نیە •

---

(١) ئەم قسەی ئێرە تەرجەمەی « ... لا ندري لعلها حفظت أو نسيت ، لها ... »یە ، جگە لەو مانای خوالێخۆشبوو فەرموویە ، دەگونجێ بە جۆرێکی دیکەیش مانا بکرێت ، بەم شێوە : « ... بۆ قسەی ژنێك کە نازانین حەدیثەکەی لەبەر کردوە یا لە بیری چۆتەوە [ ژنی موطەللەقەی بائینە ] سوکنایش و نەفەقەیشی هە ... » •

قاسمی کوڕی محەمەدو سولەیمانی کوڕی یەسار - رحمها الله تعالی - ئەڵێن : یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عاص - رحمهما الله تعالی - فاطیمەی کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی حەکەمی تەلاّق دا ، عەبدوڕەحمان بردیەوە ماڵی خۆیان • ئوممولمؤئمینین حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالی عنها - ناردیە لای مەروان ، مەروان ئەو وەختە ••• ••ئەمیری مەدینە بوو ، پێی فەرموو : تەقوا لە خوا کە بینێرەوە بۆ جێیەکەی خۆی • سولەیمان ئەڵێ : مەروان وتی : عەبدوڕەحمانی کوڕی حەکەم ، برای مەروان ، بەسەرما غاڵب بوو • قاسم ئەڵێ : مەروان وتی : قسەی فاطیمەی کچی قەیست پێ نەگەییوەتەوە [ کە لە ماڵی مێردەکەی بە ئیذنی پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - چوە دەرێ ] ؟ حەزرەتی صەدیقە - رضي الله تعالی عنها - فەرمووی : هیچ زەرەرت لێ ناکەوێ کە قسە لە قسەی فاطیمە بکەی • مەروانی کوڕی حەکەم وتی : ئەگەر ئەفەرموێ ئەوە بە واسیطەی شەڕێ بوە کە لە بەینی فاطمیەو ئەبوعەمرا بوە ئەم شەڕوعەداوەتەیش کە لە بەینی یەحیاو ژنەکەیا هەیە کافیە بۆ تۆ کە لەسەر ئەوە عیتابمان لێ نەگریت نەوەویی - رحمه الله تعالی - • لە[1]م ٦/٣١٨دا شانزە فائیدە ذیکر ئەکا :

١ - تەلاّقیغائیب دروستە :

٢ - وەکالەت لە حوقووقا دروستە •

٣ - بائینە نەفەقەی نیە بەعزێك ئەڵێن : سوکنایشی نیە •

٤ - لە ( إستفتا )دا گوێگرتن لە ژنو پیاوی بێگانە دروستە •

٥ - دروستە لە مەنزلی عیددەچوونەدەرەوە بۆ ئیحتیاجیی •

---

(١) دانەر لێرەدا بە هەڵە ( قەسطەلانی )یەکی نووسیبوو ، بەلاّم لەبەر ئەوەی زیاد بوو لامان برد •

٦ ـ دروستە زیارەتکردنی ژنی صالیحە بۆ پیاوان بەو شەرتە کە خەلوەتی موحەڕڕەمە نەبێ ، وەك پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیە وسلم ـ دەرحەقی ئوممو شورەیکی فەرموو •

٧ ـ دروستە خوازبێنیی تەلاقدراوی سێبەسێ بە تەعریض •

٨ ـ خوازبێنیی لەسەر خوازبێنیی دروستە بەو شەرتە قسەی خوازبێنیی‌کەری پێشوو بڕابێتەوە •

٩ ـ دروستە بەیانی عەیبی غائیب لەبەر مەصلەحەت‌و نەصیحەت •

١٠ـ دروستە ئیستیعمالی مەجازو کینایە ، کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیە وسلم ـ دەرحەقی ئەبوجەهمی فەرموو •

١١ـ سوننەتە مەصلەحەت پێنیشان‌دان بابیشی‌کەرهێنی ، فەرمووی : شووبە ئوسامە بکە •

١٢ـ سوننەتە قەبوولکردنی نەصیحەتی خێری ئەهلی فەضل •

١٣ـ دروستە نیکاحی غەیری کوفء بە رەزا وەك فاطیمەو ئوسامەی کوڕی زەید کە عەبدی ئازادکراوبوو •

١٤ـ حەریص‌بوون لەسەر موصاحەبەی ئەهلی تەقوا ـبا نەسەبیشی دوون[1] بێ •

١٥ـ دروستە موفتییێ ئینکاری موفتییێکی تر بکا کە لای وا بێ بە خەطا چوە وەك عایشەو عومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئینکاریان لەسەر فاطیمە کرد ؛ چونکی ئەوە بە سەبەبێکی خاص بوو فاطیمە تەعمیمی کرد لە هەموو حاڵ‌و مەکانا •

(١) واتە نەسەبی خاوەن تەقواکە کەمتر بێ‌و نزمتر بێ .

١٦- سونئەتە ضیافەت بۆ زائیرو موســافیر پیاوبێ یا ژن بێ وەك ئوmmوشورەیك - رضي الله تعالى عنها - •

( مەوقووفـو موعەللەق ) ئیبنوعومەر - رضي الله تعــالى عنهمـا - ئەفەرموێ : هەرکەسێ ئیلای کرد ، کە موددەی ئیلاکەی چوار مـانـگی تەواوە ، تەواو بوو ئەبێ یا ژنەکەی روجووع بکاتەوەو بـە چاکیی لەگەڵیا رابوێرێ ، یا تەلاقی بدا ( والذين يؤلون من نســائهم ••• الآيــة )[1] ئەوانەی ئیلا لەگەڵ ژنیانا ئەکەن ، سوێند ئەخۆن کە لەگەڵیان دروستنەبن، چوار مانگ موتتەظیر بن لەو چوار مانگەدا ئەگەر• پەشیمان بوونەوە خوا غەفوورو رەحیمە • ئەگــەر عەزمی تەلاقیان کرد خوا ســەمیعو عەلیمە ح - ٨/١٥٤ •

( مەوقووفـو موعەللەق ) ئیبنو عومەر - رضــي الله تعـالى عنهمـا - ئەفەرموێ : کە چوار مانگ تەواو بوو صەبر ئەکرێ تا تەلاقی ئـەدا ، بە موددەتەواوبوون تەلاق ناکەوێ ، تا تەلاقی ئەدا ، ئەم حوکمە لە عوثمانو عەلیو ( أبو الدردا )و عایشەو دوانزە پیاو لە ئەصحابی پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم ورضي عنهم ـەوە ریوایەتکراوە •

**لا طـلاق قبـل النكــاح[2] :**

وقول الله تعالى : ( يا أيها الذين آمنوا )[3]: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە ( إذا نكحتم المؤمنات ) : کە ژنی موسوڵمانتان هێنا ( ثم ) : لـــە پاشا ( طلقتموهن ) : تەلاقتاندان ( من قبل أن تمسوهن ) : لە پێش ئەمەدا کە لێیان بکەون ، یەعنی لە پێش جیماعا (فما لكم عليهن من عِـدَّة تعتدونها):

(١) البقــرة / ٢٣٦ •

(٢) لە پێش نیکاحا تــەلاق نیــە •

(٣) الأحـــــزاب / ٤٩ •

حەقی عیددەتان لە سەریان نیە کە هەڵیژمێرن ( فمتعوهـن ) : شـتێکیان بدەنێ حەقی ئەوەی کە دڵشکستە بوون ( وسرحوهن ) : بەرەڵلایان بکەن ( سراحا جمیلا ) بە بەرەڵلاکردنێکی جـوان ؛ زەرەریان پێ‌مەگەیێنن کـە رایان‌بگرن‌و نەچنە لایان ح ـ ٨/١٣٥ •

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئـەفەرمـوێ : خوا تـەڵاقـی خستۆتە دوای نیکاح [ لە ئیبنوعـەباس ـ رضـي الله تعـالى عنهمـا ـ سوئال‌کرا : کەسێ‌وتی : ئەگەر ئەو ژنەم هێنا تەڵاقی کەوتبێ • فەرمووی: هیچ نیە ؛ چونکی تەڵاق بۆ کەسێکە مالیـکی ژنـێ بێ • عەرزیان‌کـرد : ئیبنومەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کـەسـێ تـەڵاقی بـە وەقتێکەوە تەعلیق کرد ئەو تەعلیقە وا ئەبێ کە ئەیکا • یەعنی ئەو وەقتـە کە هات تەڵاقی ئەکەوێ • فەرمووی : ئەگەر وا بوایە خوا ئەیفەرموو : کە تەڵاقتان‌دان‌و ئەمجا نیکاحتان کردن • قەسطەلانیی ] لەمەدا کە لـە پێش نیکاحا تەڵاق نیە لە عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ و ئیبنولموسەییب‌و عوروەو ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمان‌و عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبـەو ئەبانی کوڕی عوثمان‌و عـەلی [ زەینولعابیدین ] کـوڕی حسێن ـ رضي الله تعالى عنه ـو شورەیحی قاضی‌و سـەعیدی کـوڕی جوبەیرو قاسمی کوڕی محەمەدو سالمی کوڕی ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـو طاووس‌و حەسەنی بەصریی‌و عەکرەمەو عەطاو عامیری کـوڕی سـەعـدی =کوڕی= ئەبی وەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـو جابیری کوڕی زەیـدو نافیعی کوڕی جوبەیرو محەمەدی کوڕی کەعب‌و سـولەیمانـی کـوڕی یەسارو موجاهیدو قاسمی کوڕی عەبدوڕەحمان‌و عەمری کوڕی هەریم‌و شەعبیی یەوە ئەم حوکمە کە لە پێش نیـکاحـا تـەڵاق نیـە ریـوایـەت کـراوە ح ـ ٨/١٣٥ •

ئەم مەسئەلەیە ئیختیلافی عولەمای تیا بوە ، بەعزێ ئەڵێن : (مطلقا) ئەکەوێ ، بەعزێك ئەڵێن : ( مطلقا ) ناکەوێ ، بەعزێ ئەڵێن : تەعمیمی بکا ناکەوێ ، ئەگەر تەعیینی ژنێ یا طائیفەیێ یا عەشیرەتێ یا مەکانێ یا زەمانێ =بکا= کە مومکین بێ بژی تا ئەو وەختە طەلاقی ئەکەوێ ئیمامی شافیعی - رحمه الله -و جومهوور ئەفەرموون : ( مطلقا ) ناکەوێ ئەبوحەنیفەو ئەصحابی - رحمهم الله - ئەفەرموون : موطلەقا ئەکەوێ ، جومهووری مالیکیی تەفصیلات ئەدەن لە بەینی تەعمیم‌و تەخصیصا • دەلیلی ئەوانەی کە ئەفەرموون : موطلەقا ناکەوێ ئەمەیە پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرموویەتی : « لا طلاق إلا بعد النكاح » : لە دوای نیکاح نەبێ تەلاقدان نیە • ئەوانەی کە ئەفەرموون : موطلەقا ئەکەوێ ئەفەرموون : ئیمەیش ئەڵێین : لە پێش نیکاحا تەلاق ناکەوێ [ فەقەط کە وتی : کە ژنم هێنا تەلاقی بکەوێ کە هێنای ئەکەوێ لە پێش هێنانیا ناکەوێ • فەقەط زۆر ظاهیرە کە مەعنای حەدیثەکە وا نیە • مەعنای وایە لە پێش هێنانیا بڵێ : تەلاقی بکەوێ ناکەوێ ، یەعنی کە هێنای‌و دوای هێنان بڵێ تەلاقی بکەوێ ئەو وەختە ئەکەوێ ، لە پێش هێنانا بڵێ کە ئەو ژنەم مارە کرد تەلاقی بکەوێ ، بەو لەفظە نە لە پێش هێنان‌و نە دوای هێنان ناکەوێ ، ئەبێ ئەو تەلاقدانە هەر لە دوای هێنان بێ ( والله أعلم ) قەسطەلانی ( إلى فقط وما بعده • رەشید ) •

١٢٤/٣٨٤٧ - جابر بن عبدالله - رضي الله تعالى عنهما - يقول: طُلِّقت خالتي ، فأرادت أن تَجِدَّ نخلها ، فزجرها رجل أن تخرج ، فأتت النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - فقال : بلى فجدّي نخلك فإنك عسى أن تَصدّقي أو تفعلي معروفا م - ٦/٣٢٠ •

## تەرجەمە :

جابیر - رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پوورم ـ خوشکی دایکم ، تەڵاقدرا ، تەمای بوو بچێ خورمای باغەکەی لە دار ببڕێ ، پیاوێ مەنعی کرد چوە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعـالى عليه وسـلم ـ عەرزی کرد ، فەرمووی : بـەڵێ بچۆ خورماکەت لە دار بکەرەوە بەڵکو صەدەقەیێـکی لێ ئەکەی ، یا فەرمووی خێرێکی لێ ئەکەی •

بۆ ئیحتیاجی چوونەدەرەوەی موطەللەقە دروستە •

## خـولـع( ) :

١٢٥/٣٨٤٨ - عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] أن امرأة ثـابت بن قيس [ جميلة بنت أبي بن سلول ] أتت النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم- فقالت : يا رسول الله ثابت بن قيس ماأعتب [ما أعيب، نسخة، ماأنقم•أخرى بخاري ] عليه في خلق ولا دين ولكني أكره الكفر في الإسلام • فـقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: أتردين عليه حديقته ؟ قالت : نعم• قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : اقبل الحديقة وطلقها تطليقة• قال أبو عبدالله : لا يتابع [ أزهر بن جميل ] عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - [ لأن غيره أرسله ، ولم يذكر ابن عباس - رضي الله تعالى عنـه ـ أي في طريق خالد الحذاء عن عكرمة • وإلا فطرق غير خالد موصولة كما في حديث أيوب السختياني ابن أبي تميمة عن عكرمة عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما ـ الحـديث ] •

## تەرجەمە :

جەمیلەی کچی ئوبەیی کوڕی سەلوول ژنی ثابیتی کوڕی قەیسـی ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى

عليه وسلم - عەرزیکرد : ( یا رسول الله ) ثابیتی کوڕی قەیس لە خولوقو دینا هیچ عیتابو عەیبی لێناگرم ، ئەمما لە ئیسلامەتیدا حەز ناکەم کە ئیرتیکابی کوفر بکەم [ چونکی حەزی لێ ناکەم ، بێ ئیطاعەیی ئەکەم مەبادا شتێکی وام لێ صادر ببێ کە مووجیبی کوفر بێ ، موراد لە کوفر ( والله أعلم ) رەنگە کوفرانی عەشیر بێ [کما سبق في الإيمان[1]] پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرمووی : باغەکەی بۆ ئیعادە ئەکەیتەوە [ کە دابوویێ لە باتی مارەیی ] ؟ عەرزیکرد : بەڵێ • پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - ئەمری بە ثابیت کرد : باغەکە قەبووڵ بکەو تەلاقێکی بدە•

[ لە حەدیثێکی ترا کە بە مەوصوولی ریوایەتکراوە ئەمری پێفەرموو بە ئەمری ئیرشاد نەك بە ئەمری ئیجاب ] لێبی جوێبوەوە •

تەلاقی ئیغلاق : یەعنی موکرەهـ (کأنە) خراوەتە هۆدەیێكو دەرگای لەسەر داخراوە بەزۆر ئیشێ یا ئیقرارێکی پێ ئەکەن :

کەسێکی موکرەهـ بڵێ : ئەمە خوشکمە هیچ نیە ، نە تەلاقە نە ظیهارە• ئیبراهیم - علیه الصلاة والسلام - دەرحەقی سارە فەرمووی : ئەمە خوشکمە ح - ١٣٧/٨ •

موکرەهـ ، سەرخۆش ، مەجنوون ، بە غەڵەطچوون ، لەفکرچوون ، لە تەلاقاو ، لە شیرکا ، لە غەیری ئەمانەدا حوکمیان چیە ؟

پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرموویە : عەمەل بە نیيەت موعتەبەر ئەبێ • خوا - عز وجل - لە ئاخری سوورەتی بەقەرەدا ئەفەرموێ: مەمانگرە بەوەی کە لە فکرمان چووو و کردمان ، یا بە خەطا کردمان •

---

(١) مەبەستی حەدیثی ( ٥٢/١٨٠ )ە کە لە ل : ٢٩٧ی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدایە •

ئیقراری موەسویس دروستە یا دروست نیە ؟ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بە ماعیزی فەرموو ، کە ئیقراری بە زینا کردبوو : ئەتۆ شێتی ؟ لە حەدیثی عەلیو حەمزەدا کە حەمزە وشترەکانی حەزرەتی عـەلیـی ـ رضي الله تعالی عنهما ـ زكـ دڕیو جەرگی دەرێناو کۆپارەکەی بـڕیو برژانی بۆ مەزە حەمزە بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـی فەرموو: تۆ چیت ؟ عەبدی باوکی منی ؟ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کـە زانیی سەرخۆشە پاشەوپاش گەڕایەوە ( مر في السیر )[1]•

ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : شێتو سەرخۆش تەڵاقیان ناکەوێ • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ : تەڵاقی سەرخۆشو موستەکرەه ناکەوێ [ ئیمامی شافیعیی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : سەرخۆشی قەصدیی [ تغلیظا علیـە[2] تـەڵاقی موعتەبـەرەو ئـەکـــەوێ ] •

عەقەبەی کوڕی عامیر ـ رضي الله تعـــالی عنـــە ـ [ لە فوضـــەلای صەحابەیە ] ئەفەرموێ : موەسویس کە بە وەسوەسە تەڵاقی بێ بە دڵا بەو وەسوەسەیە تەڵاقی ناکەوێ • نافیع عەرزی ئیبنوعومەر ئەکا : پیاوێ بـە قەطعیی ژنەکەی تەڵاق دا ، بەو شەرتە ژنەکەی لەماڵبچێتە دەرێ [ یـەعنی حوکمی چیە ؟ ] ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئـەگـەر بچێتە دەرێ [ یەعنی بە ئیختیار ] تەڵاقی ئەکەوێ ، گینا هیچ نیە • زوهریی ئەفەرموێ : پیاوێ بڵێ : ئەگەر وا نەکەمو وا نەکـــەم سێبەسێ تـەڵاقـی ژنەکەم کەوتبێ ئەو کەسە چی وتوەو چی لە دڵا بوە لە وەختی وتنیا لێـی ئەپرسرێ ؛ ئەگەر موددەتێکی گرتبێتە دڵ [ مەثەلا لە دڵیا وابووبێ لـــە

(١) بروانە : ل : ٢٥٨ی بەرگی چوارەمی ئەم کتێبە .

(٢) واتە بۆ سزادانیو تۆڵە لێکردنەوەی .

موددەی رۆژێکا یا دوو یا سێ رۆژا ••• إلخ ] حەواڵەی دینی خۆیو ئەمانەتی خۆی =ئەکرێ= [ یەعنی ( دیانة ) لێی قەبوڵ ئەکرێ ] لەفظی زوهریی وایە : دوو کەس لە شتێکا نیزاعیان بێ هەردوکیان تەڵاق لەسەر موددەعای خۆیان بخۆن هیچیان شاهیدی نەبێ لەسەر دەعواکەی تەڵاقیان ناکەوێ ، حەواڵەی دینی خۆیان ئەکرێن • ئیبراهیمی نەخەعیی ئەفەرموێ: بە ژنەکەی بڵێ : ئیحتیاجیم پێت نیە نییەتی چی بێ ئەوە موعتەبەرە • ح - ٨/١٣٧ ، ١٣٨ •

تەڵاقی کوللی قەومێ بە زمانی خۆیەتی [ عەجەمی بێ عەرەبی بێ ، لە رەوضەدا ئەفەرموێ : تەرجەمەی تەڵاق بە عەجەمییو لوغەتی تر بینا لەسەر مەذهەبی شافیعیی صەریحە ، بەعزێك ئەڵێن : دوو وەجهی تیایە ؛ وەجهێکی صەریحە ، وەجهێکی کینایەتە ] ح - ٨/١٣٨ • قەتادە ئەفەرموێ: بە ژنەکەی بڵێ : کە زگت پڕ بوو تەڵاقت سێبەسێ کەوتبێ لە هەر طوهرێکیا دەفعەیێ جیماعی لەگەڵ بکا دوای ئەوە ئەگەر حەملی ظاهیر ببێ سێبەسێ تەڵاقی ئەکەوێ ح - ٨/١٣٨ •

حەسەنی بەصریی ئەفەرموێ : بڵێ : بچۆرەوە لای کەسو کارت ئیعتیبار بە نییەتیە • ئیبنوعەباس [ رضي الله تعالى عنهما ] ئەفەرموێ : تەڵاق لە حینی حاجەتایە [ وەك نوشووز ] ئازادکردن بۆ خوایە [ یەعنی هەموو وەختێ موعتەبەرە ] زوهریی ئەفەرموێ : بە ژنەکەی بڵێ تۆ ژنی من نیت نییەتی موعتەبەرە ، نییەتی تەڵاق بێ ئەکەوێ ، نەبێ ناکەوێ [ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : ژنێکی شێتیان هێنایە خزمەتی عومەر - رضي الله تعالى عنه - ژنەکە لە زینا زگی پڕ بووبوو ، ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - تەمای بوو رەجمی بکا ] ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : تۆ نازانی قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە ؟:

لە شێت تا چاك ئەبێتەوە ، لە مناڵ تا باڵغ ئەبێ ، لە نوستوو تا خەبەر ئەبێتەوە [ یەعنی غەیرە موكەللەف هیچی لەسەر نیە • ئەم قسەی حەزرەتی عەلی - رضي الله تعالى عنه - بە مەوقووفو بە مەرفووع لێی ریوایەتكراوە ، مەوقووفبوونی تەرجیح دراوە بەسەر مەرفووعبوونیا ] •

عەلی [ رضي الله تعالى عنه ] تەڵاقی مەعتووە نەبێ هەموو تەڵاقێ موعتەبەرە • [ ترمذیی ئەمەی بە مەرفووعیی لە ئەبوهورەیرەوە - رضي الله تعالى عنه - ریوایەتكردوە ، ئەم موعەللەقاتانە كە نووسیومە هەموو بە مەوصوولی لە طەرەفی موحەددیثی ترەوە ریوایەت كراون ] ح - ٨/١٣٩ •

**عـدة الوفـاة(١) :**

١٢٦/٣٨٤٩ - عەبدوڵڵای كوڕی عوتبە [ی كوڕی مەسعوود ] نووسیی بۆ لای عومەری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی ئەرقەم كە بچێتە لای سوبەیعەی كچی حەرث لێی بپرسێ كە حیكایەتی خۆیو ئەوەی كە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - ئەمری پێ فەرموو چۆن بوە ؟ عومەری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی ئەرقەم بۆی نووسیەوە كە سوبەیعەی كچی حەرث [ رضي الله تعالى عنها ] خەبەری داوەتێ كە ژنی سەعدی كوڕی خەولە بوو كە لە بەنی عامیری كوڕی لوئەی بوو حازری غەزای بەدر بووبوو [ رضي الله تعالى عنه ] لە ( حجة الوداع )ا وەفاتی كرد [ سوبەیعە - رضي الله تعالى عنها - ] لێی حامیلەبوو دوای وەفاتی ئەوەندەی پێ نەچوو وەضعی حەملی كرد ، كە لە نیفاس پاكبۆوە خۆی جوان كردبوو خوازبێنی كەر ئەبوسەنابیلی كوڕی بەعكەك كە پیاوێكە لە بەنی (عبدالدار) چوە لای پێیوت : بۆ وات‌ئەبینم كە خۆت بۆ خوازبێنیكەر جوان ئەكەی؟

(١) عیددەی ژنی مێردمردوو •

بـه تەمای شوو بکەی ؟ وەڵڵاهی شوو ناکەی تا چوار مانگ‌و ده شـەوت بەسەرا رانەبووریَ ! سوبەیعە [ رضي الله تعالى عنها ] ئـەفەرمـویَ : کـه ئەوەی پیَ وتم وەختی ئیَواریَ جلەکانم لە خۆمەوەپیَچاو چوومە خزمـەت پیَغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ لیَم پرسی فتوای بۆ دام کـه لـەو وەختەدا وەضعی حەملم‌کرد حەلاڵ بـــووم ئەمری پیَ فـەرمووم ئـەگەر ئارەزووی شووکردنم بیَ شوو بکەم ح ـ ٨/٢٥٢ ، م ـ ٦/٣٢٠ د ، ن ، جه ح ـ ٨/١٧٣ •

ئومموسەلەمەی حەرەمی پیَغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ، ورضي عنها ـ ئەفەرمویَ : ژنیَ لە ئەسلەم سوبەیعەیان پیَ ئەوت لـە ژیَر نیکـاحی پیاویَکا بوو [ سەعدی کوڕی خەولە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] میَردەکەی وەفاتی‌کرد ، حامیلە بوو ، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەك داوای‌کـــرد ، شووی پیَ‌نەکرد ، پیَی‌وت : وەڵڵاهی بۆت دروست نیە شـــوو بـکەی تـا ئاخری دوو موددەکەت لیَ رائەبووریَ [ یەکیَکیان چوار مانگ‌و ده شەوە کە لە سوورەتی بەقەرەدایە • یەکیَکیان وەضعي حەملە کە لە ســـوورەتی تەڵاقایە • ئەگەر لە پیَش چوارمانگ‌و ده شەوا وەضعی حەمل بکەی ئەبیَ راوەستی‌تاچوار مانگ‌و ده شەو رائەبووریَ ، ئەگەر چوار مانگ‌و ده شەو رابوردو وەضعی حەملت نەکرد ، ئەبیَ بوەستی تا وەضعی حەمل ئەکەی ] فەرمووی : نزیکی ده شەو دوای وەضعی حەملم وەستام ، لە پاشا چـــوە خزمەت پیَغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پیَی فەرموو : شوو بـکە [ ئەم ئایەتە ئایەتی بەقەرە تەخصیص ئەکا ] ح ـ ٨/١٧٣ ، ن •

**لیعـــان :**

١٢٧/٣٨٥٠ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] أن رجـلا [ من فزارة ] أتى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : يا رسول الله ولد لي

غلام أسود [ وإني أنكرته ، م ، أخرى ] فقال : هل لك من إبل ؟ قال : نعم . قال : ما ألوانها ؟ قال : حمر . قال : هل فيها من أورق [ سپی مەیلەو رەش ] ؟ قال : نعم . قال : فأنى ذلك ؟ قال : لعله نزعه عرق . قال : فلعل ابنك هذا نزعه ح - ٨/١٦٥ ، م - ٦/٣٥٠ ، ٣٥١ ، ح - ١٠/٣١٢ ، ٣٢ . وفيه : ولم يرخص له في الانتفاء منه .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پیاوێ لە فەزارە هاتەخزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەرزیکرد : (یا رسول الله ) ژنەکەم کوڕێکی رەشی بوو ، ئینکاری ئەکەم [ یەعنی وەك لە من نەبێ ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : هیچ وشترت هەیە ؟ عەرزیکرد : بەڵێ : فەرمووی : رەنگیان چیە ؟ عەرزیکرد : سوورن فەرمووی : بۆزیان تیایە ؟ عەرزیکرد : بەڵێ . فەرمووی : ئەو بۆزە لە کوێوە هاتوە ؟ فەرمووی : رەنگە دەمارێ کێشابێتی بۆ خۆی . فەرمووی کوڕەکەی تۆیش رەنگە رەگێ کێشابێتی .

١٢٨/٣٨٥١ - عن سهل بن سعد الساعدي [ رضي الله تعالى عنه ] أن عويمرا العَجْلاني جاء إلى عاصم بن عدي الأنصاري . فقال له : يا عاصم أرأيت رجلا وجد مع امرأته رجلا أيقتله فتقتلونه ؟ أم كيف يفعل ؟ سل لي يا عاصم عن ذلك . فسأل عاصم رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ ورضي عنهما ] عن ذلك ، فكره رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ المَسائِلَ وعابها حتى كبُر على عاصم ما سمع من رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فلما رجع عاصم إلى اهله جاءه عويمر ، فقال : يا عاصم ماذا قال لك رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ؟ فقال عاصم لعويمر : لم تأتني بخير ؛ قد كره رسول الله ـ صلى الله

تعالى عليه وسلم ـ المسألة التي سألته عنها • فقال عويمر : والله لا أنتهي حتى أسأله عنها • فأقبل عويمر حتى جاء رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وسط الناس • فقال: يارسول الله أرأيت رجلا وجد مع امرأته رجلا أيقتله فتقتلونه ؟ أم كيف يفعل ؟ فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: قد أنزل الله فيك وفي صاحبتك ، فاذهب فأت بها • قال سهل [ رضي الله تعالى عنه ] فتلاعنا وأنا مع الناس عند رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فلما فرغا من تلاعنهما قال عويمر : كذبتُ عليها يا رسول الله إن أمسكتها فطلقها ثلاثا [ ظنا منه بأن اللعان لا يحرمها ] قبل أن يأمره رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ • قال ابن شهاب فكانت سنة المتلاعنين ح ـ ٨/١٦٦ ، ١٢٨ ، ١٦٨ • م ـ ٦/٣٣٤ ، ٣٣٩ ، ٣٣٨ وفيه : قال سهل : فكانت حاملا ، فكان ابنها يدعى إلى أمه ، ثم جرت السنة أنه يرثها وترث منه ما فرض الله لها • وعن سهل في هذا الحديث أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إن جاءت به أحمر قصيرا كأنه وَحَرة [ دويبة ترامى على الطعام فتفسده ] فلا أُراها إلا قد صدقت وكذب عليها ، وإن جاءت =به= أسود أعين ذا إلْيَتين فلا أُراه الا قد صدق عليها • فجاءت به على الوجه المكروه من ذلك ح ـ ٨/١٦٨ ، ح ـ ٧/٢٤٠ •

**مەئـالی هەموویـان :**

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: عوەیمیری عەجلانیی هاتە لای عاصیمی کوڕی عەدیی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ پێی‌وت : ئەی عاصیم پێم‌بڵێ : پیاوێ پیاوێکی بێگانەی لەگەڵ ژنەکەی دی بیکوژێ‌و ئێوەیش بیکوژنەوە ؟ یا چی بکا ؟ پرسم بۆ بکە• عاصم عەرزی پێغەمەری کرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ زۆری لەبەر گـران بوو ، زۆری عەیب لێ گرت •

عاصیم جوابەکەی پێغەمەری ـ صلی الله تعالی علیـه وسلم ـ زۆر لـــە لا گەورە بوو • کە تەشریفی چوەماڵەوە عوەیمیر هات وتی : ئەی عـاصـیم پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ چی فەرموو ؟ عاصیم فەرمووی : تۆ شتێکی خێرت بۆ نەهێناوم ؛ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ زۆری پێ گران بوو • عوەیمیر وتی : وەڵڵاهی واز ناهێنم تا لێی ئەپرسم • عویمیر چوە خزمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی لە ناو خەڵقا بوو ، عەرزیکرد ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسـلم ـ فـەرمووی : دەرحەق تۆو ژنەکەت قورئان نـازڵبوە ، بچـۆ بیهێنە • چـوو هێنـایو مولاعەنەیان کرد ، [ لە مزگەوتا • أخری ] سەهل ئەفەرموێ : منیش لەگەڵ خەڵقەکەدا بووم کە لە مولاعەنە بوونەوە عوەیمیر وتی: (یارسول الله) درۆم کردبێ ئەگەر ژنەکەم لای خۆم رابگرم [ وای زانی کە بە مولاعەنە لێـی حەرام نابێ ] لە پێش ئەمەدا کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـــە وسـلم ـ ئەمری پێ بکا سێبەسێ تەلاقی دا • ئیبنوشەهاب ئەفەرموێ : تەفریق لە بەینی موتەلاعینەینا بوو بـە سوننەت • سەهل ـ رضي الله تعـالی عنه ـ فەرمووی : ژنەکەی حامیلە بوو ، کوڕەکەی بە ناوی دایکیەوە بانگئەکرا، لە دوای ئەوە بوو = بە = عادەت کە کوڕو دایکەکەی = لەوەدا کە خـوا بۆی داناوە = ئیرث لە یەك بگرن • سەهل ـ رضـي الله تعـالی عنـــە ـ ئەفەرموێ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـــە وســـلم ـ فەرمووی : ئەگەر ژنەکەی منالێکی سووری کورتی وەك قۆڕیی لێ بوو ژنەکـە راســـتەو پیاوەکە درۆزنە • ئەگەر منالێکی رەشـی چاوگەورەی سمتزلی لێ بـــوو پیاوەکە راستەو ژنەکە درۆزنە • ژنەکە منالەکەی بەو وەجهە لێ بوو کـە ناخۆش بوو • یەعنی بە زانیە دەرچوو •

١٢٩/٣٨٥٢ - عن سعيد بن جبير [ رحمه الله تعالى ] قال : سئلت عن المتلاعنين في امرأة مصعب : أيُفرَّقُ بينهما ؟ قال : فما دريت ما أقول . فمضيت إلى منزل ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] بمكة ، فقلت للغلام : استأذن لي . قال : إنه قائل . فسمع صوتي ، قال : ابن جبير ؟ قلت : نعم. قال : ادخل فوالله ما جاء بك هذه الساعة إلا حاجة . فدخلت فإذا هو مفترش بَرذعة ، متوسد وسادة حشوها ليف . قلت : أبا عبدالرحمن المتلاعنان أيفرق بينهما ؟ قال : سبحان الله نعم إن أول من سأل عن ذلك فلان بن فلان ؛ قال : يا رسول الله أرأيت أن لو وجد أحدنا امرأته على فاحشة كيف يصنع ؟ إن تكلم تكلم بأمر عظيم ، وإن سكت سكت على مثل ذلك ! قال : فسكت النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - فلم يجبه . فلما كان بعد ذلك أتاه ، فقال : إن الذي سألتك عنه قد ابتليت به . فأنزل الله - تعالى عز وجل - هؤلاء الآيات في سورة النور : ( والذين يرمون أزواجهم...)(١) فتلاهنَّ عليه ووعظه وذكره وأخبره أن عذاب الدنيا أهون من عذاب الآخرة . قال : لا والذي بعثك بالحق ماكذبت عليها . ثم دعاها فوعظها وذكرها وأخبرها أن عذاب الدنيا أهون من عذاب الآخرة . قالت : لا والذي بعثك بالحق إنه لكاذب . فبدأ بالرجل فشهد أربع شهادات بالله إنه لمن الصادقين ، والخامسة أن لعنة الله عليه إن كان من الكاذبين . ثم ثنى بالمرأة فشهدت أربع شهادات بالله إنه لمن الكاذبين ، والخامسة أن غضب الله عليها إن كان من الصادقين ، ثم فرق بينهما م - ٦/٣٤٠ .

## تەرجەمە :

سەعیدی کوڕی جوبەیر [ رحمه الله تعالى . وغضب على الحجاج...] ئەفەرموێ : دەرحەقی ژنی موصعەب سوئالیان لێکردم = دەربارەی دوان

(١) النــور / ٦ - ١٠ .

که لیعان بکەن = که لێك جویئەکرێنەوە یان نا ؟ نەمزانـی چی بڵێـم • چوومە مەنزڵی ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ له مەککـە [•••••] بە غولامەکەییم وت : ئیذنم بۆ بخوازە ، وتی : چێشتەخەو ئەکا • گوێی لە دەنگم بوو فەرمووی : ئیبنوجوبەیرە ؟ عەرزم‌کرد : بەڵێ • فەرمووی : وەرە ژوورێ ، وەڵلاهی لەم ساعەتەدا ئـەبـێ ئیحتیاجیێ تۆی هێنابێ • چوومە ژوورێ ، تێفکریم سیپاڵێکی راخستبوو سەرینێکی لە ژێر ســـەرا بوو پووشەخورمای تێ ئاخنرا بوو • عەرزم‌کرد : ئەی ئەبوعەبدوڕەحمان موتەلاعینان لێك جویئەکرێنەوە ؟ فەرمووی : سوبحانەڵلاّ ! بەڵێ لێـك جوێ ئەکرێنەوە ، ئەوەڵ کەسێ کە لەوەی پرسیی فلاّنی کوڕی فلاّن بوو، عەرزیپێغەمەری کرد ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ : ( یا رســـول الله ) خەبەرم بدەرێ یەکێکمان ژنەکەی خۆی لەسەر فەحشییات ببینێ قسە بکا قسەیێکی زۆر گەورە ئەکا، بێدەنگ بێ لەسەر شتێکی زۆر گەورە بێدەنگ ئەبێ ! پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وســـکوت‌بوو ، جـوابـی نەدایەوە ، لە پاش چەندێ دوای ئەوە هاتەوە خزمەتی عەرزی‌کرد : ئەوەم بەسەرا هات کە عەرزم‌کردی • خوا ـ عز وجل ـ ئەم ئایەتانەی سوورەتـی نووری نازڵ فەرموو[1]، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـە وســلم ـ بۆی خوێندەوەو وەعظی بۆ دادا ، خوای خستەوە فـکر ، خەبەری دایـێ کــە عەذابی دنیا [ کە داری حەددە ] ئەهوەنترە لە عەذابی ئاخیرەت • عەرزی‌کرد:

(۱) دانەر ـ خ ـ لێرەدا ئایەتەکانو تەفســـیرەکەیانی نەنووسیوە ، بـۆ روونـکردنەوەی باســەکـە لێـرەدا تەفسیرەکەیان لە تەفسیری نامی وەردەگرین :

قەسەم بەوەی کە تۆی بە حەق ناردوە درۆی بەسەرەوە[1] ناکەم .

لە پاشا ژنەکەی بانگ‌کرد وەعظی بۆ خوێند ، خوای خستەوە فکر ، فەرمووی : عەذابی دنیا [ کە رەجمە ] سووکترە لە عەذابی ئاخیرەت . عەرزی‌کرد : قەسەم بەوەی کە تۆی بە حەق ناردوە درۆ ئەکا . پێغەمەر – صلی الله تعالی علیه وسلم – لە پیاوەکەوە دەستی پێکرد ، چوار دەفعە شەهادەتی دا کە راست ئەکا ، دەفعەی پێنجەم وتی : لە عنەتی خوای لێ بێ ئەگەر لەوانە بێ کە درۆزنن . ئەمجا ژنەکەی کرد بە دوەمین ؛

« ئەفەرموێت : ئەو کەسانە کە نیسبەتی زیناکردن ئەدەن بۆ لای ژنەکانیان‌و شایەتیان نیە شایەتیی بدا لەسەر ئەو تاوانە ، ئەوە بۆ ئەوە کە ئیسباتی ئەو تاوانە بکا پێویستە خۆی چوار شایەتیی بدا لای قازیی‌و ، لای کەمیی چوار کەس لە لایان حازر بن . بڵێت : شایەتیی ئەدەم بە خودا کە من راست ئەڵێم لەوەدا کە نیسبەتی ئەدەم بۆ لای ژنەکەم وەکوو زینا بێ . وە ئەگەر ویستی نەفی نەسەبی منداڵەکەیشی بکا هەم لە هەموو شەهادەتەکانیا بڵێ : وە ئەو منداڵەیش کە لە لای ژنەکەیە لە من نیە . وە بۆ جاری پێنجەم بڵێ : وە لەعنەتی خودام لەسەر بێ ئەگەر درۆ بکەم لەم نیسبەتەدا . وە بەم پێنج جوملە زیناکردن ثابت ئەبێ لەسەر ژنەکەی . جا یا ئەبێ ژنەکە ئەم تاوانە لە خۆی دووربخاتەوە بە ( لعان ) یا ئەبێ حەدی بەسەردا جاریی بکرێ .

جا ئەگەر ژنەکە ویستی تاوانەکە لەسەر خۆی لا ببات ئەبێ چوار جار شایەتیی بداو بڵێ : شایەتیی ئەدەم بە خودا بە راستیی ئەو کابرایە درۆزنە لەو نیسبەتی زینادا بۆ لای من . وە ئەگەر منداڵیشی بوو بڵێ : ئەو منداڵەیش کە لە لامە لەو کابرایە. وە بۆ جاری پێنجەم بڵێ : غەزەبی خودام لەسەر بێ ئەگەر ئەو کابرایە راست‌بکاو راستگۆ بێ لەو نیسبەتی زینادا بۆ لای من ( تەفسیری نامی ٥/٣١٩ ) .

لە هەر شوێنێکی ئەم باسەدا ناوی لیعان‌و موتەلاعینەین هاتبوو ئەوە ئەم تەفسیری سوورەتی نوورە روونکەرەوەیەتی .

(1) ئەگەر لێرەدا بفەرموێ : درۆی بۆ هەڵبەستووم ، یا درۆی بەدەمەوە کردووم راستترو کوردانەترە .

چوار دەفعە شەهادەتی دا کە پیاوەکە لەوانەیە کە درۆئەکـەن ، دەفعـەی پێنجەم وتی : غەزەبی خوای لەسەر بێ ئەگەر پیاوەکـە لەوانــە بێ کــە راستگۆن ٠ لە پاشا لێکی جوێ کردنەوە ٠

١٣٠/٣٨٥٣ ـ ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ بە موتەلاعینەینی فەرموو : حسابتان لەســەر خوایە یەکێکتـان درۆ ئەکـا ، ئیتر دەخـڵت بەسەریەوە نەماوە ٠ عەرزی کرد : ئەی ماڵەکـەم ؟ فـەرمووی : ئەگـەر راستکەی ماڵەکەت بە موقابیلی ئەوەی کە فەرجت تەصەڕوف کردوە٠ ئەگەر درۆیش کەی ئەو ماڵە لە تۆ دوورترە وەك لەوەوە [ چونکی هەم تەصەڕوفت کردوە هەم ئیفتیرایشت پێ کردوە ] ح ـ ١٧٠/٨ ، م ٣٤٣/٦ ٠

١٣١/٣٨٥٤ ـ ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالی عنــه ـ ئـەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیــه وســلم ـ پیاوو ژنــەکەی عەشـیرەتی بەنیعەجلانی لێك جوێ کردەوە ، پێی فەرموون : خوای تەعالاعیلمی هـەیە بەمە کە یەکێکتـان درۆ ئـەکا ، هیچتان تەوبە ئـەکەن ؟ م ـ ٣١٣/٦ ، ح ـ ١٦٩/٨ ( وفیە بعد هذا ) : ئیبایان کرد لە تەوبە ٠ فەرمووی : خــوا ئەزانێ کە یەکێکتان درۆ ئەکا ، هیچتان تیایە کە تەوبە بکا ؟ ئیبایان کرد ٠ پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : خوا ئەزانێ کە یەکێکتان درۆ ئەکا ، یەکێکتان تیایە کە تەوبە بکا ؟ ئیبایان کرد ٠ لێکی جوێ کردنەوە ح ـ ١٦٩/٨ ٠

١٣٢/٣٨٥٥ ـ ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعـالی عنهما ـ ئەفەرموێ : لە حوضووری پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بەحث لە مولاعەنـە کرا ، عاصمی کوڕی عەدیی ـ رضي الله تعالی عنه ـ قسەیێکی نالایەقی کرد [ وتی : ئەگەر پیاوێ پیاوێکی دی لەگـەڵ ژنـی خـۆی بەشیر لێیدا تـا ئەیکوژێ ؟ ( الکرمانی عن ابن بطال )] لە پاشاعاصیم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە پیاوێ لە قەومەکەی [ کە عوەیمیرە ] هاتە لای پێی وت : پیاوێکی لەگەڵ

ژنەکەی دیوە • عاصم [ رضي الله تعالى عنه ] فەرمووی : ئەمەم لەوەوە بەسەرا هات کە لە حوضووری پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وتم [ لە ناو خەڵقا لێم پرسیی ] پیاوەکەی بردەخزمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەوەی عەرزکرد کە لە ژنەکەیەوە دیبووی ، ئەو پیاوە ( عوەیمیر ) زۆر زەردو لەڕ بوو مووی ڕێك بوو ، ئەوی کە ئیددیعای ئەکرد کە لەگەڵ ژنەکەیی دیوە گۆشتن و قەڵەو بوو ، ئەسمەر بوو [ موو لوول بوو م ـ ٣٤٦/٦ ] پووز ئەستوور بوو ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : خوایا بەیانی بکە • ژنەکە منالێکی بوو ئەشوبها بەوەی کە عوەیمیر ئەیوت بەسەر ژنەکەیەوە دیوە • پیاوێ عەرزی ئیبنوعەباسی کرد ـ رضي الله تعالی عنهما ـ لەو مەجلیسەدا : ئەو ژنە ـ ئەو ژنەیە کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دەرحەقی فەرموویەتی : ئەگەر کەسێکم بێ ( بینة )و شاهید رەجمبکردایە ئەو ژنەم رەجم ئەکرد [ یەعنی ئەو ژنە ژنەکەی عوەیمیرە ] ؟ ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ فەرمووی : خەیر ئەوە ژنێکە لە ئیسلاما فیعلی فاحیشەی ئیظهارئەکرد • [ ئەمما ثابت نەبوو کە رەجم بکرێ ] ح ـ ١٦٩/٨ ، م ـ ٣٤٥/٦ ، ن •

١٣٣/٣٨٥٦ ـ ئەنەس ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : هیلالی کوڕی ئومەییە ـ رضي الله تعالی عنه ـ [ کە لەو سیانە بوو کە بێ‌عوزر لە غەزای پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بۆ تەبووك دواکەوتن ، بە واسیطەی راستیی خۆیانەوە کە درۆیان لە خزمەت پێغەمەرا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ نەکرد ، خوا لە سوورەتی بەرائەتا تەوبەی بۆ نازڵ‌کردن ] قەذفی ژنەکەی کرد بە شورەیکی کوڕی سەحماوە ، کە برای دایکیی بەرای کوڕی مالیك بوو • ئەوەڵ کەسێکە لە ئیسلاما لیعانی کردوە ، لیعانی لەگەڵ ژنەکەی کرد • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه

وسلم - فەرمووى : تەماشاى كەن ئەگەر منالێكى سپیی بوو مووی ساف بوو ( قضيىء العينين ) : چاو پڕوپووشاویی بوو ئـەوه هـی هیلاله ، ئەگەر چاورەش بوو ، موولوول بـوو ، قاچباریك بـوو ، ئـەوه لـه شورەیكی كوڕی سەحمایه =ئەنەس = ئەفەرموێ : خەبەرم درایێ كـه چاورەشو موولوولبوو ، قاچباریك بوو م - ٣٤٤/٦ •

٣٨٥٧/١٣٤ - ئیبنوعەباس - رضي الله تعـالى عنهما - ئەفەرموێ : هیلالی كوڕی ئومەییه - رضي الله تعالى عنه - قەزفی ژنەكەی كـرد بـه دەم شورەیكی كوڕی سەحماوه ؛ هاته خزمەت پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - شەهادەتی دا [ یەعنی موافیقی قورئان ] پێغەمەر - صـلى الله تعالى عليه وسلم - ئەیفەرموو : خوا ئەزانێ یەكێكتان درۆئەكەن [ یەعنی كامتان درۆ ئەكا به موعەییەنی ئەیزانێ ، گینا منیش ئەیزانم ؛ چونـكی جەمع له بەینی نەقیضەینا مەحاڵه ] هیچ كامتان هەیـه كـه تەوبـه بكـا ؟ ئەمجا ژنەكەیش هەڵسا شەهادەتی دا ح - ١٦٦/٨ • ( مسـتغنى عنـه بمـا بعـده ) •

٣٨٥٨/١٣٥ - عن ابن عباس - [ رضي الله تعالى عنهما ] أن هلال بن أمية - رضي لله تعالى عنه - قذف امرأته عند النبي - صلى الله تعالى عليـه وسلم - بشريك بن سَحْماء ، فقال النبي - صلى الله تعالى عليه وسـلم -: البينة أو حدٌ في ظهرك • فقال : يا رسول الله إذا رأى أحدنا على امرأتـه رجلا ينطلق [ يلتمس البينة ؟ ] فجعل النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - يقول : البينة وإلا حد في ظهرك • فقال هلال : والذي بعثك بالحـق إنـي لصادق فلينزلن الله مايبرىء ظهري من الحد • فنزل جبريل [ عليه السلام ] وأنزل عليه : ( والذين يرمون أزواجهم •••) فقرأ حتى بلغ ( إن كـان من الصادقين ) فانصرف النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - فأرسل إليها . فجاء

هلال فشهد [ أربع شهادات بالله إنه لمن الصادقين ، فيما رماها به .
والخامسة أن لعنة الله عليه إن كان من الكاذبين في الرمي ] والنبي ـ صلى
الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : إن الله يعلم أن أحدكما [ على التعيين ] كاذب
فهل منكما تائب ؟ ثم قامت فشهدت [ أربع شهادات بالله إنه من الكاذبين
فيما رماني به ] فلما كانت عند الخامسة وقّفوها وقالوا : إنها موجبة
[ للعذاب إن كنت كاذبة ] . قال ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] فتلكأت
[ تباطأت ] ونكصت حتى ظننا أنها ترجع . ثم قالت : لا أفضح قومي سائر
اليوم فمضت . فقال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : أبصروها ؛ فإن
جاءت به أكحل العينين سابغ الإليتين [ سمت خر ] خدلّج الساقين
[ پووز ئەستوور . له حەدیثی ئەنەسا : قاچ باریك ] فهو لشريك بن
سحماء . فجاءت به كذلك ، فقال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ :
لولا ما مضى من كتاب الله لكان لي ولها شأن ح ـ ٢٤٣/٧ .

## تەرجەمە :

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : هیلالی کوڕی
ئومەییە ـ رضي الله تعالى عنه ـ قەذفی ژنەکەی خۆیی کرد بە زینا لە
خزمەت پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە شورەیکی کوڕی
سەحماوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ
فەرمووی : یا بەیینەو ئیثبات ، یا داری حەد لە پشتت . عەرزی کرد :
( یا رسول الله ) کەسێ پیاوێ ببینێ بەسەر ژنیەوە بچێ بگەڕێ بۆ
شاهید ؟! پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ هەر ئەیفەرموو : یا
ئیثبات ، یا داری = حەد لە پشتت = هیلال ـ رضي الله تعالى عنه ـ
فەرمووی : قەسەم بەوەی تۆی بە حەق ناردوە راستم درۆ ناکەم ئەبێ
خوا ئایەتێکم بۆ نازڵ بکا کە پشتم لە داری حەد نەجات دا . جیبریل

ـ عليه السلام ـ ئەو ئایەتانەی سوورەتی نووری نازڵکردە سەر پێغەمەر ـ صلی الله تعالى عليه وسلم ـ [ رب أشعث ... الحديث ] پێغەمەر ـ صلی الله تعالى عليه وسلم ـ تا ( من الصادقين )ی خوێندەوە • پێغەمەر ـ صلی الله تعالى عليه وسلم ـ گەڕایەوەو ناردی بە شوێن ژنەکەیشیا ، هیلالیش هات ، چوار دەفعە شەهادەتی بە خوا دا کە راستە، پێنجەم ئەگەر درۆ بکا لەعنەتی خوای لێ بێ • پێغەمەریش ـ صلی الله تعالى عليه وسلم ـ ئەیفەرموو : خوا عیلمی هەیە بەوەی کە یەکێکی موعەییەنتان درۆزنە ؛ هیچ کامتان تەوبە ئەکەن ؟ لە پاشا ژنەکەی هەڵسا چوار دەفعە شەهادەتی دا ، کە هیلال درۆ ئەکا لە قەذفەکەیا • کە هاتە سەر جاری پێنجەم رایانوەستان وتیان : ئەم پێنجەمەی مووجیبی عەذابە • ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : ئەو وەختە ژنەکە درەنگێکی کردو چوە دواوە ، وامان زانی کە پەشیمان ئەبێتەوەو ئیقرار ئەکا ، لە پاشا وتی : قەومەکەم تا ئەبەد موفتەضەح ناکەمو ئابڕوویان نابەم ! شەهادەتە پێنجەمەکەیشی دا •

پێغەمەر ـ صلی الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : کە منالەکەی بوو تێیفکرن ئەگەر چاوڕەش بوو ، سمتخڕ بوو پووزخڕ بوو ـ لە حەدیثی ئەنەسا قاچباریك بوو ـ ئەو منالە لە شورەیکی کوڕی سەحمایە • منالەکەی وا بوو • پێغەمەر ـ صلی الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەو کیتابوڵلایە [ یەعنی ئەو ئایەتانە ] نەبوونایە = کە رابوردن = ئیشێکی گەورە لە بەینی منو ئەو ژنەدا واقیع ئەبوو [ یەعنی وام رەجمئەکرد کە هەموو کەس عیبرەتی لێ بگرێ ] •

١٣٦/٣٨٥٩ ـ ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : سەعدی کوڕی عوبادە ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کرد

ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : پیاوێکم بەسەر ژنەکەمەوە دی هیچ دەخلی نەکەم تا ئەچم چوار شاهید بێنم ؟! [ یەعنی تا چوار شاهید ئێنمو بێمەوە ئەوان لە ئیشی خۆیان ئەبنەوە ] پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : بەڵێ وایە • سەعد عەرزیکرد : خەیر وەڵڵا قەسەم بەوەی کە تۆی بە حەق ناردوە لە پێش ئەوەدا بە شیر چارەی ئەکەم ! پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : گوێتان لە قسەی سەییدەکەتانە چەندە غەیوورە ؟! من لەو بەغیرەتترم ، خوایش لە من بە غیرەتترە م ـ ٦/٣٤٧ ؛ ٣٤٨ ، ح ـ ٨/١٠٥ ؛ ١٠٦ في (٣) أحاديث •

١٣٧/٣٨٦٠ ـ مغيرة بن شعبة قال : قال سعد بن عبادة [ رضي الله تعالى عنهما ] : لو رأيت رجلا مع امرأتي لضربته بالسيف غير مُصْفِحٍ عنه [ أي غير ضارب بصفح السيف بل بحده ] فبلغ ذلك رسول لله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : أتعجبون من غيرة سعد ؟ فوالله لأَنَا أغيرُ منه ، والله أغير مني ، من أجل غيرة الله حرم الفواحش ما ظهر منها وما بطن . ولا شخص أغير من الله ، ولا شخص أحب إليه العذر من الله ، من أجل ذلك بعث الله المرسلين مبشرين ومنذرين ؛ ولا شخص أحب إليه المِدْحَة من الله، من أجل ذلك وعد الله الجنة م ـ ٦/٣٤٨ •

## تەرجەمە :

سەعدی کوڕی عوبادە ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئەگەر پیاوێکم چاو پێبکەوێ لەگەڵ ژنەکەما بە شیر لێی ئەدەم بە پانییەکەی لێی نادەم بە دەمی لێی ئەدەم • ئەم قسەی سەعدە بە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ گەیییەوە ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ

فەرمووی : ئێوە بۆ تەعەججوب ئەکەن لە غیرەتی سەعد ؟ وەڵڵاهی من لەو بەغیرەتترم ، خوا لە من بە غیرەتترە ، لە بەر غیرەتزۆریی خوا فەحشیاتی حەرامکردوە بە ئاشکراو بە دزێتیی ، هیچ کەسێ نیە کە لە خوا بەغیرەتتر بێ ، هیچ کەسێ نیە کە لە خوا زیاتر عوذر قەبووڵکردن بحوبێنێ ، بۆیە خوا پێغەمەرانی ناردوە کە موژدە بدەن‌و خەڵق لە حەرام بترسێنن • هیچ کەسێ نیە کە لە خوا زیاتر مەدحی پێخۆش بێ ، بۆیە وەعدەی بە جەنەت داوە •

تم بحمد الله كتاب النكاح •

یەك شەممە ١٨/١/٩٤٢

# كتـاب ما يذكـر في الجنايات[1]

## ئيكـــــراه

في ســورة النحل : ( إلا من أكــره وقلبــه مطمئن بالإيمــان ) :[2]
بــه تهحقيق ئهوانهى باوهڕ به ئاياتى خوا ناكهن خـــوا هيدايهتيان نـادا ،
عهذابى زۆر بهئازاريان ههيه ، ههر ئهوانهن ئيفتيرا ئهكهنو درۆ ههڵبهستن
( و ئهڵێن : ئهوه له طهرهف خواوهيه ] كه ئيمان به ئاياتى خواو قورئــان
نيه [ كه ئهڵێن ئهم قورئانه قسهى بهشهره ] درۆزن ههر ئهوانهن [ كه بـه
تۆ ئهڵێن موفتهريت ، تۆ نيت ] ههركهسێ دواى ئهمه كه ئيمانى هێنـاوه
كافر ببێ به زمان غهيرى ئهوهى كه ئيكراهى لێ كراوه [ كه تهلهفوظ بكـا
به كهليمهى كوفرو تهلهفوظى پێكرد ، ئهمما ] دڵ موطمهئيننه بـه ئيمـان
[ ئهوه مهحفووظه له عهذابى ئهليم ] ئهمما ئهوهى كه [ به دڵ كافر ئهبێو ]
خوا دهرگاى دڵى بۆ كوفر كردۆتهوه ئهوانه غهزهبى خوايان لهسهر بـێو
عهذابى بهشيددهتيان ههيه • [ أتى أمر الله ] ح ـ ١٠/٨٩ •

موكرهه زهعيفه ناتوانێ ئهوى ئهمرى پێ ئهكرێ نهيكا ح ـ ١٠/٩٠ •
حهسهنى بهصريى ـ رحمه الله تعالى ـ ئهفهرموێ : تا رۆژى قيامهت تهقيـه

---

(١) باسى جينايات •
(٢) النحـــل / ١٠٦ •

هەیە • ئیبنوعەباس [ رضي الله تعالى عنهما ] ئەفەرموێ : کەسێ دز ئیکراهی لێبکاو بە زۆر ژنی پێ تەڵاق بدا هیچ نیە • ئیبنوعومەرو ئیبنوزوبەیـرو شەعبیی‌و حەسەنی بەصریش ـ رضي الله تعالى عنهم ـ وایانفەرموە ، ئیعتیبار بـە نیەتـە ح ـ ٩١/١٠ •

خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : جارییەی خۆتان ئیجبار مەکەن لەسەر زیناکردن کە خۆیان عیفەت‌و ناموسیان ئەوێ بۆ ماڵی دنیـا ، ئـەوانەی کە بە زۆر زینایان پێئەکەن بۆ پارە لە دوای ئەمە کە بە زۆر زینایان پێکرا خوا لە زینایان خۆش ئەبێ‌و رەحمیان پێ ئەکاو عەذابیان نادا ح ـ١٠/٩٣ •

نیـکاحی موکرەهـ دروست نیە لە نیکاحا رابورد • بە زۆر عەبدێکی پێ بە یەکێکی تر هیبە بکەن یا پێی بفرۆشن دروست نیە • بەعزێ کـەس [کە حەنەفین] ئەوی ئەو عەبدە ئەکڕێ لەوەی کە بە زۆر پێی ئەفرۆشێ ئەو عەبدە نەذر بکا ، یا بڵێ : کـــە من مردم ئـــەو عەبدە ئـــازاد بێ نـەذرو ئازادکردنەکەی دروستە [ مەقصوودی بوخاریی وایـــە قسەی حـەنەفی موتەناقیضە ، ئەگەر بەیعی موکرەهـ ببێ بە سەبەبی ئینتیقالی میلك هەموو تەصەڕوفی دروستە مەخصووص نابێ بە نەذرو تەدبیر ، ئەگەر ناقیل نەبێ نەذرو تەدبیرەکەیش دروست نیە • وەکوو ئەوە وایە من بچم ماڵی یەکێکی تر زەوت بکەم‌و بیکەم بە خێر • ح ـ ١٠/٩٤ •

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئایەتی نیســا کـە ئەفەرموێ : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە بۆتان حەڵاڵ نیە کە بە زۆر ژنان بە ئیرث بگرن •• دەرحەقی ئەوانە نازڵ بوە کە پیاوێ بمردایە واریثی پیاوەکە موستەحەقتر ئەبوون بەو ژنە ، ئەگەر هەوەسیان بوایەو جوان بـوایە هەر بە مارەییە پێشوەکەی یەکێکیان مارەی ئەکرد ، ئەگەر هەوەسیان بوایە

ئەیان دا بە شوو بە یەکێکی تر ، مارەیی‌یەکەیان وەرەگرت ، هەوەسیان بوایە ئەیان‌بەستەوە [ تا ئەمرد نەیان‌ئەهێشت‌شوو بکا ] ح - ٩٥/١٠ .

صەفیەی کچی ئەبوعوبەیدە ئەفەرموێ : عەبدێکی مالی خەلیفە ، یەعنی عومەر - رضي الله تعالى عنه - بە زۆر جارییەیەکی لە خومس بێ بن کرد ، عومەر - رضي الله تعالى عنه - داری حەددی لە عەبدەکە داو نەفی کرد [ تا نیو سالْ ] جارییەکە چونکی موکرەهە بوو حەددی لێ نەدا ح - ٩٥/١٠ .

زوهریی ئەفەرموێ : حورِ جارییەێی بێ بن بکا ئیقامەی حەددی لەسەر ئەکرێ ، قیمەتی جاریەکە تەقدیر ئەکرێ بە[1] وقووف [ چەندەی نوقصان هێنابێ ئەدرێ بە صاحێبەکەی ] جارییەی ثەییب ئەئیممە تەضمیناتیان بۆ دانەناوە داری حەد ئەدرێ لە پیاوەکە ح - ٩٦/١٠ .

دروستە [واجبە] کە ئینسان ترسی بێ لەمە کە پیاوێ بە زولْم بکوژن بۆ نەجاتدانی سوێن بخوا بلێ برامە . واجبە شەڕی لەسەر بکا ، ئەگەر زالْمەکە بکوژێ هیچی لەسەر نیە ، دروستنیە تەسلیمی بکا ، پێی بلێن شەراب بخۆرەوە ، مردارەوەبوو بخۆ ، عەبدەکەت بفرۆشە ، ئیقرار بە قەرز بکە ، تەلاق بدە ، عەبد ئازاد بکە ... یاخۆ باوکت یا برات ئەکوژین .. بۆی دروستە ئەوانە هەمووی بکا بۆ نەجاتدانی نەفس [ ئەو تەصەڕوفاتانەی هەموو بەتالە حوکمی نیە ] بەعزێك ئەلێن [ کە حەنەفین ، کما قیل ] ئەگەر پێی بلێن یا ئەبێ شەراب بخۆیتەوە یا گۆشتی مردارەوە بوو بخۆی گینا باوکت یا کوڕت ، یا کەسێکی خزمت ئەکوژین بۆی دروست نیە ئیطاعەی ئەمرەکە

(١) لێرەدا وشەیەك نووسراوە وەك ( أهكي ) وایە نەمزانی مانای چیە .

یکا بۆ مودافەعەی ئەوانە ، هەر بۆ موحافەظەی خۆی بۆی دروستە ، ئەڵێن : چونکە بۆ غەیری نەفسی خۆی موضطەر نیە • ئەو بەعزە لە پاشا بە ضیددی ئەم قسەیەی ئەڵێ : ئەگەر پێی بڵێن : یا باوکت یا کوڕت ئەکوژین ، یا ئەبێ ئەم عەبدەت بفرۆشی ، یا ئیقرار بە قەرز بکەی ، یا هیبە بکەی بە قیاس ئەم عەقدانەی مونعەقید ئەبێ ، [ لازم نایێ صەبر بکا لەسەر باوک و کوڕی با بۆ بزنێ بیانکوژن ] ئەمما ئێمە ئیستیحسان ئەکەین ، بە ئیستیحسان ئەڵێن : بەیع و هیبەو هەموو عەقدێ لەوەدا باطیلە هاتوون فەرقیان کردوە لە بەینی خزم و کەس و کاری ئەجنەبیدا، بە بێ کیتاب و سوننەت و حەدیث [ هەر بەرەئیی خۆیان ] گینا بێگانەو خزم و باوک و کوڕ هیچ فەرقیان نیە ، هەموویان بە ئەمری خواو رەسوولی خوا مودافەعەیان فەرزە ، حەتتا بە ظاهیر ئیرتیکابی کوفریان بۆ ئەکرێ ح - ٩٦/١٠ ، ٩٧ •

ئیبراهیمی نەخەعیی ئەڵێ : ئەوی سوێند طەڵەب ئەکا ئەگەر زاڵم بێ نییەتی سوێندخۆر موعتەبەرە ، بۆی دروستە تەورییە بکا ، ئەگەر مەزڵووم بێ نییەتی سوێنددەر موعتەبەرە سوێندخۆر تەورییەی بۆ دروست نیە ح - ٩٧/١٠ [مەثەلا پیاوێ ئیددیعای دە لیرە لە یەکێ بکا ئەگەر ئیددیعاکەی درۆ بێ کێ سوێند ئەخوا قسەی دڵی ئەو موعتەبەرە ، ئەگەر پارەکەی دابێتیو لێی سەندبێتەوە لە دواییا لای قازیی سوێندی بدا کە نەتداومێ بۆی هەیە بەو لەفظە سوێندی بۆ بخواو نییەتی وابێ کە قەرزدارت نیم ، ئەگەر ئیددیعاکەی راست بێ پارەکەی دابێتەوەو شاهیدی نەبێ نییەتی قەرزدارەکە موعتەبەرە ] •

**نەذر نەهی لێ کراوە :**

١/٣٨٦١ - عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال : نهى النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - عن النذر قال : إنه [ لا يقدم شيئا ولا يؤخره

إنما يستخرج به من الشحيح • م لا يأتي بخير • م ] لا يرد شيئا إنما يستخرج به من البخيل ح - ٩/٣٣٧ ، ٣٨٨ ، م - ٧/١١٠ د ، ن ، جه •

٢/٣٨٦٢ - عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : لا تنذروا فإن النذر لا يغني من القدر شيئا ، وانما يستخرج به من البخيل م - ٧/١١٠ •

٣/٣٨٦٣ - وعنه عن النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - : إن النذر لا يقرب من ابن آدم شيئا لم يكن الله - عز وجل - قدره له ، لكن النذر يوافق القدر فيخرج بذلك من البخيل ما لم يكن البخيل يريد أن يخرج م - ٧/١١١ ، ح - ٩/٣٣٧ ، بلفظ : ولكن يلقيه القدر وقد قدرته له أسْتَخْرِجُ بِهِ من البخيل = ح - ٩/٣٨٩= •

## تەرجەمە :

لە حەدیثی ئیبنوعومەرو ئەبوهورەیرەدا - رضي الله تعالى عنهم - ئەفەرموێ : پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - نەهی لە نەذر کردوە ، فەرموویەتی : نەذر هیچ قەزاو قەدەر ناگێڕێتەوە ، هیچ شتێ لە وەختی خۆی نە پێش ئەخاو نە پاش ئەخا ، نزیکی ناخاتەوە کەسێ کە بەخیل بێ‌و ئیرادەی نەبێ شتێك لە ماڵی خۆی بکاتەدەرێ خوا - عز وجل - بەو نەذرە ئەو میقدارە لە ماڵی ئەو کەسە ئەکاتە دەرێ •

**نەذری طاعەت‌و مەعصییەت‌و وەفا بە نەذر :**

( وما أنفقتم من نفقة ) : ئەوی لە رێی خوادا یا لە رێی شەیتانا صەرفی ئەکەن ( أو نذرتم من نذر ) : ئەو شتەی کە لە طاعەتا یا لە مەعصییەتا نەذری ئەکەن (=فإن الله يعلمه=) : خوا عیلمی پێی هەیە بە پێی نییەتتان موکافاتتان یا موجازاتتان ئەداتەوە ( وما للظالمين من أنصار ) :

ئەوانەی کە زاڵمن ، کە لەبەر تەحصیلی رەزای شەیتان ئیش ئەکەن نــە طەرەفی خواوە هیچ ناصیریان نیە ح ـ ٣٩٠/٩ •

٣/٣٨٦٣[1] ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : من نذر أن يطيع الله فليطعه ، ومن نذر أن يعصيه فلا يعصه ح ـ ٣٩٠/٩ ، د ، ت ، ن ، جه •

## تەرجەمە :

کەسێ نەذری طاعەت بکا لازمە لەسەری بەجێی بێنێ کەسێ نەذری مەعصییەت بکا حەرامە بەجێی بێنێ •

٤/٣٨٦٤ ـ عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کـرد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ( یا رسول الله ) لە زەمانی جاهیلییەتما نەذرم کرد کە لە ( مسجد الحرام ) ئیعتیکاف بگرم ، فــەرمووی : نـەذرەکەت بەجێ بێنە • ح ـ ٣٩١/٩ ، م ـ ١٤١/٧ •

نەذری صــەومو حــەجو ئیعتیکاف لــەو بابانـەدا نووسراوە • ( نــەذر بـەســـە ) •

**الأيمـــــان[2]:**

وفيه ( لا يؤاخذكم الله باللغو في أيمانكم ، ولكن يؤاخذكم بما عقدتم الأيمان ؛ فكفارته إطعام عشرة مساكين من أوسط ما تطعمون أهليكـم ، أو كسوتهم ، أو تحرير رقبة ، فمن لم يجد فصيام ثلاثة أيام ، ذلك كفـارة أيمانكم إذا حلفتم ، واحفظوا أيمانكم ، كذلك يبين الله لكـم آياته لعلكـم تشـــكرون )[3] •

(١) دانەر ـ خ ـ بە هەڵە ئەم ژمارەی دووپات کردۆتەوە •
(٢) باسی سـوێن •
(٣) المـائـدة / ٨٩ •

## تەرجەمە :

خوا موئاخەذەتان ناکا بە لەغـوی ئەیمان ، کـە مەقصوودتان سوێندخواردن نەبێ ، دەمتان پێی راهاتبێ وەك : نەوەڵلا ، بەڵێوەڵلا ٠٠إلخ ئەمما بەو سوێندە موئاخەذەتان لەسەر ئەکا کە بـە دڵ جەزمتان نـابێ بەسەر سوێندا ، مەقصوودتان بەو سوێندە مەحکەمکردنی مەقصوودەکەتان بێو نەیشیکەن ، ئەگەر نەیکەن کەفارەتی ئەو سوێندە ئیطعامی دە میسکینە [ هەر یەکە موددێ ] لەوەی کە خۆتان لە ئەکثەری ئەحوالا ئەیدەن بـە ماڵو منالتان لە غالبی قووتی بەلەد یا لیباسێکیان بدەنێ [ کراسێ، دەرپێیێ، سوخمەیێ ، مێزەرێ ، جامەدانەیێ ، کەوایێ ٠٠ ئاوریشم بێ ، خوریی بێ، لۆکە بێ ٠٠٠ هەر لەوانە بێ کە لەبەر ئەکرێ ، ئەو لیباسە ئاوریشم بێ بیدا بە پیاو هی بچووك بە گەورە ، گەورە بە بچووك هەمووی دروسـتە ٠ قەسطەلانیی ] یا عەبدێ ئازاد بکا ئەگەر نەیبوو سێ رۆژ بەڕۆژوو بێ ، کە سوێندتان خواردو بە جێ نەهات ئەمە کەفارەتی سوێندتانە سوێندتـان موحافەظە بکەن کە خواردتان مەیخەن ، خـوا چـۆن بـەیانی ئـەحکـامی سوێندخواردنی بۆ بەیانکردن بەو نەوعە ئەحکامی ترتان بـۆ بەیان ئـەکا تاکوو شوکری بکەن ٠

٥/٦٨٦٥ - عن عائشة [ رضي الله تعالى عنها ] أن أبا بـكر[1] [ رضي الله تعالى عنه ] هیچ سوێندی نەئەشکان تا کەفارەتی سوێند نازڵبوو ، ئەو وەختە فەرمووی : سوێند لەسەر هیچ شتێك ناخۆمو غەیری ئەو شـتەم لەوەی کە سوێندم لەسەر خواردوە بە چاتر بزانمو سوێندەکە نـەخـەمو چاترەکە نەکەم [ یەعنی سوێندم لەسەر شتێ خواردو خیـلافی ئـەوەم بە چاتر زانی سوێندەکەم ئەخەمو ] کەفارەتی بۆ ئەدەم ح - ٣٤٦/٩ ٠

(١) حەزرەتی عائیشە ئەفەرموێ : حەزرەتی ئەبوبەکر ...

٣٨٦٦/٦ ـ عن عبدالله [ بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ] قال : كثيرا ما كان النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يحلف : لا ومقلب القلوب ح ـ ٣٤٣/٩ ، ت ، ن ، جه •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ زۆر جار سوێندی وا ئەخوارد: خەیر قەسەم بە ( مقلب القلوب ) = کە مەبەستی خوایە ، **یانی دڵگۆڕ** = •

٣٨٦٧/٧ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : أتى رجل [ عقبة بن عامر الجهني ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] إلى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال له : إن أختي نذرت أن تحج ، وإنها ماتت ، فقال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : لو كان عليها دين أكنت قاضيه ؟ قال : نعم• قال : فاقض الله [ حقه ] فهو أحق بالقضاء ح ـ ٣٩٢/٩ • سبق نظائره في الحج والصوم •

**تەرجەمە :**

عەقەبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ عەرزیکرد : خوشکەکەم نەذری کرد کە حەج بکا مرد [ نەذرەکەی بەجێ نەهێنا ] پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەگەر قەرزی خەڵقی بەسەرەوە بوایە بۆت ئەدایەوە ؟ عەرزیکرد : بەڵێ • فەرمووی : حەقی خوا بدەرەوە ، خوا لە خەلق موستەحەقترە کە قەرزی بدرێتەوە •

٣٨٦٨/٨ ـ عیمرانی کوڕی حوصەین ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ثەقیف سوێندخواری بەنیعەقیل بوو ، ثەقیف دوو پیاوی لە ئەصحابی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى

عليه وسلم ـ بە ئەسیر گرت ، ئەصحابی پێغەمەر ـ صلی الله تعـالی علیـه وسلم ـ پیاوێـکیان لە بەنیعەقیل ئەسیرکرد ، لەگـەڵ ئـەو پیاوەدا ( عەضـبا ) یشان بە تالاّن گرت • پێغـەمەر ـ صـلی الله تعـالی علیه وسلم ـ تەشریفی بە لای ئەو پیاوە ئەسیرەدا رابورد ، لە پێوەندا بوو بانگی کـرد یا محمد ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـه وسـلم ـ تـەشریفی چوە لای فەرمووی : چیت ئەوێ ؟ عەرزیکرد : بە چ حەقێ تۆ منت گرتـوە ؟ بـە چ حەقێ ( سابقة الحاج ) ت [ یەعنی عەضبا کە وشتری پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسـلم ـ ]ە گرتوە ؟ فـەرمووی : بـە گوناهی سوێندخوارەکەت [ کە ثەقیفە دوو ئەصحابیان گرتوە بە ئەسیر ] لە پاشا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشریفی لە لای رۆیی • دووبارە بانگیکردەوە یامحمد، یامحمد ! پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رەئووفو موشـفیقو بـە مەرحەمەت بوو ، تەشریفی گـەڕایەوە لای فـەرمووی : چیت ئـەوێ ؟ عەرزیکرد : من موسوڵمانم• فەرمووی: ئەگەر لە پێش ئەسیریتا موسوڵمان بوویتایە کە ئەو وەختە مالیکی نەفسی خـۆت بـووی بە تەواوەتی نەجاتت ئەبوو [ نەخۆت ئەسیر ئەکرای ، نە ماڵت بە تالاّن ئەچوو ، ئـەممـا دوای ئەسیریی ئیسلام‌بوونت لە ئەسیرییو تالاّنی ماڵت نەجاتت نـادا خۆیشتو ماڵیشت ئەبن بە موڵکی غەزایی ] لە پاشا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـه وسلم ـ لە لای تەشریفی گەڕایەوە دەفعەی سێیەمیش بانگیکرد : یامحمد، یامحمد ! پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تەشـریفی چـوەوە لای عەرزیکرد : برسیمە طەعامم بدەرێ ، تینوومە ئاوم بـدەرێ بیخۆمەوە • فەرمووی ئەوە ئیحتیاجیتە [ یەعنی دەفـع ئەکرێ ] لـه دواییدا بەو دوو پیاوە صەحابیە کە ثەقیف ئەسیری کردبوون بەرەڵلا کـران • عیمـران ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : ژنێکیش لە ئەنصار کـە ژنی ئەبوذەڕ

بوو - رضي الله تعالى عنهما - بە ئەسیر گیررا لەگەڵ عەضبادا [ کە ئەو وشترە بوو لەو پیاوەوە دەستکەوتبوو ، پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - هەڵی‌گرتبو بۆ خۆی ] ژنەکە لە بەندا بوو ، ئەو قەومەیش کە گرتبوویان بە ئەسیر ئێواران وشترەکانیان لە بەردەمی ماڵەکانیان مۆڵ ئەدا ، شەوێك ئەو ژنە لە بەندەکەی بەرەڵلا بوو بوو ، چوو بە لای وشترەکانەوە لەهەر وشترێ نزیك‌ئەبۆوە ئەی‌بۆڕان ، ژنەکەیش وازی لێ ئەهێنا تا گەیی‌یە عەضبا [ کە وشترەکەی پێغەمەر بوو - صلى الله تعالى عليه وسلم - ] ئەو نەیبۆڕان ، عیمران - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : ئەو وشترە وشترێکی تەعلیم‌کراو بوو ، ژنەکە سواری پاشکۆی بوو لێی خوڕی‌و هەی‌پێی لێ‌کرد پێیان‌زانی‌و شوێنی کەوتن نەیان‌گرت ، نەذری کرد ئەگەر خوا بەو وشترە نەجاتی دا [ بیکا بە خێر ] سەری ببڕێ ، کە گەیی‌یە مەدینەخەڵق دییان وتیان : وشترەکەی پێغەمەرە - صلى الله تعالى عليه وسلم - وتی : نەذرم‌کردوە کە خوا بەم وشترە نەجاتم بدا سەری ئەبڕم بە خێر • ئەوەیان عەرزی پێغەمەر کرد - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : سوبحانەڵلا چ موکافاتێکی خراپی داوەتەوە ؟! نەذری کردوە کە خوا نەجاتی بدا بەو بێنێ سەری بڕێ ! وەفا ناکرێ بە نەذرێ کە لە گوناها بێ • وەفا ناکرێ بە نەذری شتێ کە موڵکی ئەو نەبێ م - ١١٢/٧ •

لە ریوایەتەکانا ( ناقة منوقة ، ناقة مجرّسة ، ناقة مدربة يعني مذللة ) تەعلیم‌دراو • ( نذروا علموا ) •

٣٨٦٩/٩ - عن عقبة بن عامر [ رضي الله تعالى عنه ] عن رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : كفارة النذر كفارة اليمين م - ١١٧/٧ •

**تەرجەمە :**

= عوقبەی کوڕی عامیر ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـه وسـلم ـ فەرموویەتی = کەفارەتی نەذر کەفارەتی سوێندە •

١٠/٣٨٧٠ ـ عمر بن الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] يقول : قـــال رسول الله ـ صلى الله تـعالى عليـه وســلم ـ : إن الله ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم • قال عمر [ رضي الله تعالى عنه ] : فوالله ما حلفت بها منذ سـمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نهى عنها ذاكرا ولا آثرا [ أي لا قائلا لها من قبل نفسي ، ولا حالفا عن غيري ] م ـ ١١٨/٧ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : خوا ـ عز وجل ـ نەهیتان لێ ئەکا کە سوێند بە باوکتان بخۆن [ بڵێ : بە سـەری باوکـم ] ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : وەڵڵاهی لەو ڕۆژەوە کە لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ م بیست کە نەهی لێ ئـەفەرموێ سوێندم پێ نەخواردوون ، نە بۆ خۆم نە لە باتی خەڵق •

١١/٣٨٧١ ـ عن عبدالله [ بن عمر ـ رضي الله تـعالى عنهمـا ـ ] عن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنه أدرك عمر بن الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] =في ركب= وعمر يحلف بأبيه ، فناداهم رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: ألا إن الله ـ عز وجل ـ ينهاكم أن تحلفوا بآبائـكـم فمن كان حالفا فليحلف بالله أو ليصمت م ـ ١١٨/٧ ح ـ ٦٤/٩ وفي سـورة النجم وفي الأدب والاستئذان •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ لە ناو چەند سـوارێکا بـە عومەر گەیی ـ رضي الله تعالی عنه ـ سوێندی بە باوکی ئەخوارد • پێغەمەر

ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بانگی فەرموونێ : خەبەرتان ئەدەمێ کە خوا ـ عز وجل ـ نەهێتان لێ ئەکا کە بە باوکتان سوێند بخۆن ، کەسێکتان تەمای بێ سوێند بخوا بە خوا سوێند بخوا یا نەیخواو بێدەنگ بێ •

١٢/٣٨٧٢ ـ ئیبنوعومەر ـ رضـي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : کەسێ تەمای سوێندخواردنی بێ هەر بە خوا بیخوا ، قورەیشی بە باوکیان سوێندیان ئەخوارد ، پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : سوێند بە باوکتان مەخۆن م ـ ١١٩/٧ •

١٣/٣٨٧٣ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالی عنه ـ قال : قال رسول الله ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ: من حلف منكم فقال : في حلفه باللات والعزّى فليقل لا إله إلا الله [ ولم ينسبه الى الكفر ح ـ ٣٦١/٩ نیسبەتی نەداوەتە ئەلای کوفر ، یەعنی کافر نابێ ، گینا ئەمری پی ئەفەرموێ : بە کەلیمەی شەهادەتەین • فەسطەلانیی ] ومن قال لصاحبه : تعال أقامرك فليتصدق [ بشيء • أخرى ] م ـ ١٢٠/٧ ، ح ـ ٦٤/٩ ، ٣٦٠ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : هەرکەسێ سوێندی خوارد لە سوێندەکەیا وتی : قەسەم بە لاتو عوززا بلێ ( لا إله إلا الله ) ظاهیر وایە یەعنی تەجدیدی ئیمانی بکاتەوە • کەسێ بە کەسێ بلێ : بێ قومار بکەین • شتێك بکا بە صەدەقە • زوهریی نزیکی حەفتا حەدیثی هەیە هیچ کەس لەو حەدیثانەدا نەبوە بە شەریکی ، یەکێکیان ئەم حەدیثی ( تعال أقامرك )یە ، موسلیم ١٢١/٧ •

١٤/٣٨٧٤ ـ عن عبدالرحمن بن سمرة [ رضي الله تعالی عنه ] قال :

قال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - لا تحلفوا بالطواغي ، ولا بآبائكم م - ١٢١/٧ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : سوێند بە بتان مەخۆن‌و ، بە باوکیشتان مەخۆن •

١٥/٣٨٧٥ - عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : (لا يؤاخذكم الله باللغو)[1] له (لا والله وبلى والله) دا نازڵ بوه ح - ٣٦٨/٩•

١٦/٣٨٧٦ - ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : لە وەختێکا کە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - خوطبەی ئەخوێند پیاوێکی دی لەبەر هەتاوا راوەستابوو ، پرسیی : بۆ لەبەر هەتاوا وەستاوە ؟ عەرزیان‌کرد : ئەبوئیسرائیله نەذری کردوە کە هەر راوەستێ‌و دانەنیشێ‌و نەچێتە بەر سێبەرو قسە نەکاو هەر بەڕۆژوو بێ ! پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : پێی بڵێن : قسەیش بکاو دایش‌بنیشێ بیش‌چێتە بەرسێبەر ، ئەمما ڕۆژووەکەی تەواو بکا ح - ٣٩٣/٩ ، د ، جه •

١٧/٣٨٧٧ - عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - پیاوێ نوێژی خەوتنانی لە خزمەت پێغەمەرا کرد - صلى الله تعالى عليه وسلم - کە چووە ماڵەوە مناڵەکانی نووستبوون ، ژنەکەی طەعامی بۆ هێنا چونکی مناڵەکانی نوستبوون سوێندی خوارد کە نایخوا ، لە پاشا پەشیمان‌بۆوەو خواردی ، چوە خزمەت پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه

(١) البقرة / ٢٢٥ . دانەر - خ - بەو شێوەی سەرەوە نووسیویە ، واتە حەزرەتی عائیشە ئەفەرموێ : ئەم ئایەتە لە سوێندی نەوەڵلاو ئەرێ وەڵلادا ، واتە سوێندی بێ ئاگایی‌و سەرزارەکیدا هاتوەتە خوارەوە .

وسلم ـ عەرزی‌کرد ، فەرمووی : هەرکەسێ لە شتێ سوێندی خوارد لە دوایا غەیری ئەوەی لا باشتر بوو بیکاو کەفارەتی سوێندەکەی بدا م ـ ١٢٨/٧ ۰

١٨/٣٨٧٨ ـ ئەبوموساى ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رەفیقەکانم ناردمیانە خزمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ کە حەیوانی سواریی لێ طەلەب‌بکەین لەو وەختەدا کە لە خزمەتیا بووین لە ( جیش العسرة )دا کەغەزای تەبووکە ، عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) رەفیقەکانم منیان ناردۆتە خزمەتت کە سواریان بکەی ۰ فەرمووی : وەڵڵاهی سوارتان ناکەم لەسەر هیچ شتێك ، لە وەختێکا چووبوومە خزمەتی کە لە حاڵی غەضەبا بوو ، من لەوە بێ‌خەبەر بووم ، لەبەر ئەوە کە هیچی نەدامێ کە سواری بین‌و ، لە ترسی ئەوەیش کە مەبادا پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ دەرحەقم شتێکی لێ بە دڵەوە گرتبم ۰۰ بە مەحزوونیی گەڕامەوە لای رەفیقەکانم ، خەبەری ئەوەم دانێ کە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ پێی‌فەرمووم ، هەر بە قەد ساعەتێ وەستام‌و بانگی بیلالم بیست کە ئەیوت : ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس ! جوابم دایەوە ، وتی : ئیجابەتی پێغەمەر بکە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ بانگت ئەکا ۰

کە چوومە خزمەتی فەرمووی : ئەم دوو وشترەو ، ئەم دوو وشترەو ، ئەم دوو وشترە بگرە ۰ شەش وشترەکە لە قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی کڕیبوو ، فەرمووی : بیانبە بۆ رەفیقەکانت ، پێیان بڵێ : کە خوا ، یا فەرمووی : کە رەسوولوڵڵا ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ سواری ئەمانەتان ئەکا ، سواریان بن ۰ ئەبوموسا ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : بردمن بۆ رەفیقەکانم پێم‌وتن : پێغەمەر ـ صلی الله

تعالى عليه وسلم - سواری ئەمانەتان ئەکا • ئەمما وەللاهی وازتان لێ نایێنم تا بەعزێکتان لەگەڵم نەیێنە خزمەت ئەوانەی کە گوێیان لەوە بـوو کـە پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - بە منی فەرموو لەو وەختەدا کـە بۆ ئێوە داوام کردو نەیدامیو لە پاشا پێی عەطافەرمووم ، تا وا نەزانن کە من لە خۆمەوە شتێکم بە ئێوە وت کـە ئـەو نەیفەرموویێ • رەفیقەکـانم پێیانوتم : وەللاهی تۆ لای ئێمە راستییو چۆن حەزەکـەی وا ئەکەین • ئەبوموسا - رضي الله تعالی عنه - چەنـد کەسێکی لە ئەصحابی بردە لای ئەوانەی کە گوێیان لە فەرموودەی پێغەمەر بوو - صلی الله تعالی علیـه وسلم - کە بە ئەبومووسای فەرموو بوو ، لە ئـەوەڵەوەنەیدانێو لـە پاشـا داینێ ، ئەوانـە خەبـەریان دانـێ بـەوەی کـە ئـەبـومووسـا خـەبـەری دابوونـێ بـە تەواوەتـی بـێ کـەمو زۆر م - ۷/۱۲۳ •

۳۸۷۹/۱۹ - زوهدوم ئەفەرمێ لە خزمەت ئەبومووسـادا بووین - رضي الله تعالی عنه - سوفرەی طەلەبکرد ، بۆیان هێنا گۆشتی مریشکی لەسەر بوو ، پیاوێکی سوور لە بەنی ( تیم الله ) هات ، لە مەوالیی ئەچوو [ یەعنی ئازادکراو ] ئەبومووسا - رضي الله تعالی عنه - پێیفەرموو : وەرە بخۆ پێغەمەرم دی - صلی الله تعالی علیه وسلم - کە لە گۆشـت مریشکی

(۱) دانەر - خ - لە سووچێکی لاپەڕەکەوە بە قەڵەمێکی شین ، دیارە لەکاتی پیاچوونەوەدا ، ئەمەی نووسیوە :

« ظاهیر وایە ئەو وشترە تاڵانیە لە تەقسیما بەر قەیس کەوتبێو پێغەمـەر - صلی الله تعـالی علیه وسلم - لێی کڕیبێو دابێتی بەوان . ( فلا منافاة بینه وبین ما سبق ) » .

مەبەستیشی ئەوەیە ئەم حەدیثەو حەدیثەکـەی پێشوو یـەك بخـاتو ئاڵۆزیی لە نێـوان ماناکانیانـا نەیێڵێ ، چونکی لـەوێ ئەفەرموێ : وشترەکانی لە قەیس کڕیو لێرە ئەفەرموێ : تاڵانییان هێنا .

ئەخوارد ، پیاوەکە وتی : چاوم پێکەوت کە شتێکی پیسی ئەخوارد بێزم لێکرد سوێندم خوارد کە نەیخۆم • فەرمووی : بێ لەوە خەبەرت بدەمێ : لەگەڵ جەماعەتێ لە ئەشعەریی چوومە خزمەت پێغەمەر ـ صلی الله تعالى علیه وسلم ـ کە سوارمان بکا فەرمووی : وەڵڵاهی سوارتان ناکەم ، هیچم لا نیە کە سواری ئەوەتان بکەم • مووددەتێ وەستاین وشتری تالآنیان هێنایە خزمەت ، بانگی کردین پێنج وشتری کۆپارەبەرزی داینێ ، فەرمووی: کە رۆیینەوە جێی خۆمان بە یەکتریمان وت : سوێندەکەمان نەختەوە بیری پێغەمەر ـ صلی الله تعالى علیه وسلم ـ وەڵڵاهی بەرەکەتی نابێ بۆمان • گەڕاینەوە خزمەتی عەرزمانکرد : ( یا رسول الله ) هاتینە خزمەتت سوارمان بکەی سوێندت خوارد کە سوارمان نەکەی ، کەچی سوارتکردین ـ سوێندەکەت لە فکر چۆتەوە ؟ فەرمووی : وەڵڵاهی ( إن شاء الله ) لە سەر هیچ شتێ سوێند ناخۆمو غەیری ئەو شتە بە خێرتر بزانمو ئەو شتە خێرە نەکەمو کەفارەتی سوێندەکەم نەدەم • بڕۆنەوە ئەوە خوا ئێوەی سوارکردوە م ـ ٧/١٢٤ ، ح ٥/٢٠٨ ، ح ـ ٦/٤٢٥ •

٣٨٨٠/٢٠ ـ عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : من حلف على يمين فرأى غيرها خيرا منها فليأت الذي =هو= خير وليكفر عن يمينه م ـ ٧/١٢٩ •

## تەرجەمە :

هەرکەسێ سوێندی لە شتێ خوارد لە دواییدا غەیری ئەوەی بە چاك زانی چاکەکە بکاو کەفارەتی سوێندەکەی بدا •

٣٨٨١/٢١ ـ تەمیمی کوڕی طورفە ئەفەرموێ : سائیلێ هاتەخزمەت عەدیی کوڕی حاتەم داوای میقدارێ لە قیمەتی خادیمێکی لێکرد ، فەرمووی : غەیری زرێو کڵاوزرێکەم هیچ شتێکم لە لا نیە ، ئەنووسم

بۆ ماڵەوە بتدەنێ • پیاوەکە قەبووڵی نەکرد ، عەدیی رقی هەڵسا فەرمووی: وەڵڵاهی هیچت نادەمێ ، لە دواییا پیاوەکە رازیی بوو عەدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : وەڵڵاهی ئەگەر لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـــه وسلم ـ م نەبیستایە کە ئەیفەرموو : هەرکەسێ سوێندی لەسەر شتێ خوارد لە پاشا غەیری ئەوەی بەتەقواتر زانی تەقواکـــە بکا •• ســـوێندەکـەم نەئـەخســـت م ـ ۷/۱۲۹ •

۳۸۸۲/۲۲ ـ لە ریوایەتێکی ترا ئەفەرموێ : داوای صـــەد درهەمی لێکرد فەرمووی : داوای صەد درهەمم لێ ئەکەی ؟ من کوڕی حـاتـەمم وەڵڵاهی ناتدەمێ ! ( والباقي بمثل ماسبق ) م ـ ۷/۱۳۰ •

۳۸۸۳/۲۳ ـ عبدالرحمن بن سمرة [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : قال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يا عبدالرحمن بن سمرة لا تسألِ الإمارة فإنك إن أوتيتها عن مسئلة وكلت إليها ، وان أوتيتها من غير مسئلة أُعِنْتَ عليها ، وإذا حلفت على يمين فرأيت غيرها خيرا منها فكفر عن يمينك وائت الذي هو خير ح ـ ۹/۳٤۷ وفي الأحكام والكفارات ، أبو داود في الخراج، الترمذي في الايمان ، النسائي قصة الإمارة في السير ، وقصة اليمين في الأيمـان • القســـطلاني •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بە عەبدوڕەحـمانی کـــوڕی سەمورەی فەرموو ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەی عەبدوڕەحمانی کـوڕی سەمورە داوای مەئمووریيەت مەکە ؛ چونکی ئەگەر بە داواکردن بتدرێتێ ئـەوە حەواڵە بە خۆت ئەکرێ [ یەعنی دیارە خۆت هیچت لە دەست نـاێی ئەو کارە قورسە بکەی ] ئەگەر بێ داواکردن بتدرێتێ [ لە طەرەفي خواوە]

موعاوەنەتت ئەکرێ • کە لەسەر شتێکیش سوێندت خوارد لە پاشا بۆت مەعلووم بوو کە غەیری ئەوە خێرترە کەفارەتی سوێندەکەت بدەو ئەوی کە خێری تیایە بیکە • ئەوە بکە کە خێرە •

لە حەدیثەکەی پێشوودا سوێندخستنەکەی پێش کەفارەتخست ، لەم حەدیثەدا کەفارەتی پێش خست • شافیعیی‌و مالیك‌و جومهوور – رضي الله تعالى عنهم – دروستە پێشخستنی کەفارەت ، فەقەط شافیعیی – رضي الله تعالى عنه – فەرموویەتی : ئەگەر کەفارەتەکەی رۆژوو بێ ئەبێ دوای‌خا چونکی عیبادەتی بەدەنییە • غەیری رۆژوو سونەتە دوای‌خا • لای حەنەفیی پێشخستنی دروست نیە • دەلیلمان ئەم حەدیثەیە ، لە ریوایەتی ئەبوداوودا ئەفەرموێ : کەفارەتەکەی بدە لە پاشا ئیشە خێرەکە بکە • قەسطەلانیی •

**نییەت لە سوێندا :**

٢٤/٣٨٨٤ – عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] : =قال= رسول الله – صلى الله تعالى عليه وسلم – : **يمينك على ما يصدقك عليه [به• أخرى]** صاحبك [ اليمين على نية المستحلف • أخرى ] م – ٧/١٣١ •

## تەرجەمە :

یەعنی ئەگەر قازیی سوێندی کەسێکی دا نییەتی قازییەکە موعتەبەرە، تەورییە دروست نیە • یەعنی لای قازیی بڵێ : تا رۆح لە قەفەسی ئەم سنگەدایە ئەو ئیشە ناکەم ، لە پاشا چۆلەکەکەی ناو باخەڵی سەربڕێ‌و بیکا ، یا بڵێ ئەم نەفسە ئەو شتەی نەکردوە •••= سوێندەکەی ئەکەوێ=•

**الاصرار في اليمين(١) :**

٢٥/٣٨٨٥ ـ عن أبي هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال [ جزء من حديث مر في الجمعة ] : نحن الآخرون السابقون =يوم القيامة= ، فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ: والله لأَن يلج أحدكم بيمينه في أهله آثَمُ له عند الله من أن يعطي كفارته التي افترض الله عليه ح ـ ٣٤٨/٩ ، م ـ ١٤٠/٧ وعنه قال : قال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : من استلج [ من اللجاجة أي الإصرار ] في أهله بيمين فهو أعظم إثما لِيَبَرِّ يعني الكفارة ح ـ ٣٤٩/٩ •

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئێمـە لـــە دوای هەموو ئوممەتێ هاتووینە دنیا ، لە ئاخیرەتا لە هەموویان لەپێشترین [زووتر حسابمان ئەکرێو زووتر ئەچینە بەهەشت ] فەرمووی : وەڵلاهی ئینسـان لەسەر سوێند ئیصرار بکا [ و بەو ئیصرارە ئەهلو عەیالی زەرەر بێنێو ] بەو سوێندەوە بچێتە ماڵەوە ، لای خوا گوناهبارتر ئەبێ لەوەی کە سوێندەکەی بخاتو کـەفارەتی بدا ، بـــا واز لە ئیصـــرارو لـەجاج بێنێ ، یـەعنـی کـەفارەتەکەی بـدا •

**ئیســـتیذانو ســــــەلام :**

٢٦/٣٨٨٦ ـ عن عقبة بن عامر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إياكم والدخول على النساء • فقال رجل من الأنصار : يا رسول الله أفرأيت الحمو ؟ قال : الحمو الموت ح ـ ١١٠/٨،

(١) سووربوون لەسەر سوێند .

م ـ ٨/٤٧٥ ت ، ن • الحمو : أقارب الزوج [ ممن ليس بمحرم لها ] م ـ ٨/٤٧٦ •

لام وایە ئەحادیثی ئیستیذانم نووسیوە[1]، ئەگەر نەمنووسیبێ ئەم عەددانەیە مەلا سەلام ـ خوا خۆیو باوکیو خوشەویستیان سەلامەتکا ـ بیان نووسێ : م ـ ٨/٤٦١ ، ح ـ ٩/١٣٨ ، ١٣٧ ، ١٣٥ ، ٦٥ ، ١٢٩ ، م ـ ٨/٢٦٤ ، ٢٧١ ، ٤٧٢ ، ٤٧٣ ، ٤٧٥ ، ٤٧٧ ، ٤٥٧ ، ٤٥٨ ، ٤٥٩ ، ٤٦٠ ، استئذان أبي موسى على عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خ ـ ١٠/٦٥، م ـ ١٠/٥٣ •

**القصاص[2] :**

قال الله ـ تعالى ـ: ( كتب عليكم القصاص في القتلى ... )[3] الآية في سورة البقرة •

( وما كان لمؤمن أن يقتل مؤمنا إلا خطأ ... )[4] الآيات • رحم الله تعالى من يكتبها بترجمتها[5] •

**تەفسیری ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرە :**

( يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم القصاص في القتلى : الحر بالحر ، والعبد بالعبد ، والأنثى بالانثى ) :

---

(١) بەڵێ راست ئەفەرمووی ، ئەم باسە لە ل : ١٢٠ی بەرگی پێنجەمدایە •
(٢) تۆڵە سەندنەوە •
(٣) البقرة / ١٧٨ •
(٤) النساء / ٩٢ •
(٥) واتە : خوا رەحم بەو کەسە بکا لەگەڵ تەرجەمەکانیانا ئەیاننووسێ • لەسەر ئەم داواو دۆعای دانەرە بە هیوای رەحمی خوایش وا تەفسیری ئایەتەکان بە گوێرەی ( تەفسیری نامی ) هەر لەسەرەوە دەنووسم •

له بوخاریی شه‌ریفا ئه‌فه‌رمویٚ : ئه‌م ئایه‌ته هاته‌خواره‌وه له دووهۆز له هۆزی عه‌ره‌به‌كان كه جه‌نگیان‌كرد له ناوخۆیانا ئه‌یانوت : لــه باتــی به‌نده‌یه‌كمان فــلانی كوری فلان ئــه‌كوژین‌و ، له بــاتــی جــارییــه‌مان فلانه ژنی وا ئه‌كوژین •

كه وابوو مه‌به‌س له‌م ئایه‌ته ئه‌مه‌یه هیچ لایێ له حه‌قی خۆیان لانه‌ده‌ن‌و زیاده‌ره‌وی نه‌كه‌ن • واته ئه‌ی كه‌سانێ كــه ئیماتان هێناوه بــه خــودا فه‌رزكراوه له‌سه‌رتان تۆڵه له هۆی كوژراوه‌كانه‌وه ، واته پێویسته له‌ســه‌ر بكوژ مل كه‌چ بكا بۆ ئه‌وه سه‌رۆكی موسولمانان بیكوژێته‌وه له تۆڵه‌دا ، وه پێویسته بۆ خاوه‌ن حه‌ق له ئه‌ندازه‌ی تۆڵه‌ی خۆی لانه‌دا ، ئاده‌میزادی ئازاد له باتی ئاده‌میزادی ئازادو ، به‌نده له باتی به‌نده‌و ، مێیینه لــه بــاتی مێیینه‌و •• له‌وه به‌ولاوه ره‌وا نیه له ئایینی ئیسلاما •

جا مادام ئه‌م ئایه‌ته بۆ لابردنی ته‌جاوزاتی خه‌ڵكی هاتوه لــه حــه‌ق سه‌ندنه‌وه‌دا ئیتر ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ كه ئازاد له تۆڵه‌ی به‌نده‌دا ناكوژرێت‌و پیاو له تۆڵه‌ی ژندا ناكوژرێت • وه ئه‌م حوكمانه حه‌واڵه‌ی پێشــه‌واكانن بــه ئه‌ندازه‌ی ئه‌و ده‌لیلانه ده‌ستیان كه‌وتوه • وه لــه مه‌زهه‌بی ئێمه‌دا پــیاو ئه‌كوژرێ له خوێنی ژنا ، وه ئه‌گه‌ر دوو سێ پیاو پیاوێكیان كوشت هه‌موو ئــه‌كــوژرێنــه‌وه •

جا ئه‌م فه‌رزبوونی قیصاصه به‌م مه‌رجه‌یه خاوه‌ن حه‌ق بیه‌وێ قیصاص وه‌ربگرێته‌وه • ئه‌گه‌ر ویستی عه‌فوی بكا به خۆڕایی ، وه یا له موقابیلی ( دیه )دا ، واته له به‌رانبه‌ری ماڵێكی تایبه‌تیدا ئه‌توانێ ، وه‌كو خودای ته‌عالا فــه‌رمــوویــه‌تــی :

( فــمن عفــي لـــه من أخيــه شــيء ) :

واته : ئه‌گه‌ر ئاده‌می كوژێ عه‌فوو چاوپۆشیی بۆ هات له لایه‌نی برای

خۆیەوە بە ئەندازەیێ لە عەفو ، واتە هەر حەقی خۆی عەفو بکا ئەگەر حەقدار زۆر بن ، وە یاخود هەموو حەقەکە هەر عائیدی ئەو بێ •

( فاتباع بالمعروف وأداء إليه بإحسان ):

ئەوە واجبە لەسەر ئەو کەسەی عەفوەکە ئەکا بە پیاوەتیو چاککردەوەیی داوای ئەو ماڵە بکا کە بڕیاریداوە • وە واجبە لەسەر کابرای پیاوکوژ ئەو ماڵە پێشکەش بکا بە بێ ماتڵکردنو کەمکردنەوە •

( ذلك تخفيف من ربكم ورحمة ) :

دامەزرانی یاسای چاوپۆشیی لە ( قیصاص ) بارسووککردنە لە لایەنی خوداوەو میهرەبانییە •

( فمن اعتدى بعد ذلك فله عذاب أليم ) (١٧٨) :

دەی هەرکەسێ تەجاوز بکا لە پاش چاوپۆشیی لە قیصاصو وەرگرتنی ماڵەکە ـ واتە ئەگەر کابرای ماڵوەرگر بڕوا کابرا بکوژێ ، وە یا ماڵدەر ماڵەکە نەدا ـ ئەوە لە لایەنی خوداوە عەزابێکی گرانی ئێشگەیێنی بۆ هەیە •

( ولكم في القصاص حياة يا أولي الالباب لعلكم تتقون ) (١٧٩) :

واتە بۆ ئێوە هەیە لە دامەزرانی یاسای قیصاصدا ، وەکو باسمانکرد ، حەیاتو زیندەگییەکی گەورەی بە نرخ ئەی خاوەن عەقڵە ساغەکان • جا رجامان وایە خۆتان بپارێزن ، چونکی پیاوکوژ لە ترسی قیصاص ناوێرێ کەس بکوژێ وا حەیاتی کوژراوەکە ئەپارێزرێ • وە مادام ئەو نەکوژرا ئەمیش ناکوژرێ لە قیصاصا وا حەیاتی ئەمیش مایەوە• وە لە لایەکی ترەوە کاتێ یاسای قیصاص دامەزرا خەڵك لەبەر طائیفەگەریی

له باتی پیاوێ چەن پیاو ئاکوژن وا ئەم نەوعە حەیاتەیش هەم دەس کەوت ....(1)

تەفسیری ئایەتەکانی سوورەتی نیساء :

فەرموودەی خودا : ( وما كان لمؤمن أن يقتل مؤمنا ) :

ئیبنوجەریر ریوایەتی کردوە لە عەکرەمەوە ئەڵێ : حەرثی کوڕی یەزید لە بەنی عامیری کوڕی لوەی لەگەڵ ئەبوجەهلدا عەزابی عەیاشی کوڕی ئەبو رەبیعەیان ئەدا . پاش موددەیەك حەرث موسوڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ لای حەزرەت -د- بۆ مەدینەی مونەووەرەو لە ڕێگەدا گەییشت بە عەیاش و عەیاشی لەسەر ئەو تەعزیبە کە لە لایەنی ئەوەوە کرابو بێ پرس و مەسلەحەت دایە بەر شیرو کوشتی ! وە گومانی وابوو هەر کافرەو هات خەبەری دا بە حەزرەت ،جا ئەم ئایەتە نازڵ بوو .

( وما كان لمؤمن أن يقتل مؤمنا إلا خطأ ) :

ڕەوا نیەو ناجۆرە بۆ موسوڵمان کە موسوڵمان بکوژێ مەگەر بە هەڵە.

( ومن قتل مؤمنا خطأ فتحرير رقبة مؤمنة ودية مسلمة إلى أهله إلا أن يصدقوا ) :

وە هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی تر بە هەڵە بکوژێ ئەوە فەرزە لە سەری کە بەندەیەکی موسوڵمان ئازاد بکاو هەم واجبی شانیەتی دیيەکە تەسلیم بکرێ بە خوێنڕەسی ئەو کوژراوە سا مەگەر بیکەن بە بەخشش و وەری نەگرن .

( فإن كان من قوم عدو لكم ) :

ئەگەر کوژراوەکە لە قەومێ بوو کە دوژمنی ئێوە بن .

---

(1) بڕوانە : تەفسیری نامی مەلا عبدالكريمی مدرس ١/٢٩٤ .

( وهـو مـؤمـن ) :

وە کابرا موســـوڵمان بـوو ٠

( فتحـــرير رقبـــة مؤمنـة ) :

ئەوە واجبی قاتڵەکە بەس ئازادکردنی بەندەیەکی موسوڵمانە ، ئیتـر دییـەو خوێنی نیە ؛ چونکی ئەو کوژراوە موسوڵمانەو قەومەکەی کافرن‌و ،ئەو کافرانە میرات وەرناگرن لە موسوڵمان ٠

( وإن كان من قـوم بينكم وبينهم ميثـاق ) :

وە ئەگەر کوژراوەکە لە قەومێکی کافری وا بوو کە لە بەینی ئێوەو ئەوانا پەیمان بوو وە دەستان بۆ یەك نەدەبرد ٠

( فدية مسلمة إلى أهله وتحرير رقبة مؤمنة ) :

ئەوە واجب دییەیەکە بدرێ بە خوێن‌ڕەسە موعاهیدەکانی : چـونکی خوێنی کافری موعاهید ئەدرێ بە کـــافری موعـاهیـد ، وە ئازادکردنـی بەندەیەکی موسوڵمانیشــە ٠

( فمن لم يجد فصيام شهرين متتابعين ، توبة من الله ) :

وە ئەگەر کابرای قاتڵ دەستی نەدەڕۆیی کە بەندە ئازاد بــکا ئـەوە واجبەکەی ڕۆژووگرتنە لە ماوەی دوو مانگدا ڕۆژ بە دوای ڕۆژا وە ئەمە دامەزراوە لە بەر ئەوە کە خودا تەوبە لەو قاتڵە قەبووڵ بکا ٠

( وكـان الله عليمـا حكيما ) (٩٢) :

وە خودای تەعالا زانایە بە حاڵی هەموو لایێ‌و خاوەن حیکمەتیشە لە هەمـوو کارێــکدا ٠

( ومن يقتـل مؤمنـا متعمـدا ) :

هـەرکەسێ موسوڵمانێ بکوژێ بـە قەسدو مەبەس و حەقی کوشتنی نـەبێ بـە یاسای ئیسـلام •

( فجزاؤه جهنـم خالـدا فيهـا ) :

ئەوە جەزای ئەو پیاوکوژە یا ئەو ژنکوژە دۆزەخەو حاڵی کابرا وایە تیایا ئەمێنێتەوە هەتـا هەتایـە •

( وغضب الله عليـه ولعنـه ) :

وە خودا غەزەبی خۆی ڕژاندوە بەسەریاو نەفرینی لێکردوەو دووری خستوەتەوە لە میهرەبانیی خۆی •

( وأعـد لـه عـذابا عظيمـا ) ( ٩٣ ) :

وە بۆی ئامادە کردوە سزایەکی گەورە •»[١]

٣٨٨٧/٢٧ - عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال : قال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - : لن يزال المؤمن في فسحة من دينه ما لم يصب دما حراما ح - ٣٩/١٠ •

**تەرجەمە :**

موئمین مادام خوێنی نەڕژتبێ هەر لـە فەرەحی دینـی خۆیـا ئـەبێ غـائیلەی نـەبێ •

٣٨٨٨/٢٨ - وعنه قال [ موقوفا ] : إن من وَرْطات الأمـور التي لا مخرج لمن أوقع نفسه فيها سفكَ الدم الحرام بغير حله ح - ٤٠/١٠ •

**تەرجەمە :**

خوێنڕژانی حەرام بە ناحەق لەو شتە موهلیکانەیە کە ئەو کەسـەی خۆی هاویتە ناوی قەت لێی نایێتە دەرێ •

---

(١) بڕوانە : تەفسیری نامی ، مەلا عبدالکریمی مدرس ٢/٣٩٢ •

٣٨٨٩/٢٩ ـ وعن عبدالله [ بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ] قال : قال النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : أول ما يقضى بين الناس في الدماء [ الصلاة • أخرى • أي في حقوق الله فلا منافاة ]• ح- ١٠/٤٠ •

## تەرجەمە :

ئەوەڵ موحاکەمەیێ کە لە بەینی خەڵقا ئەکرێ [ لە قیامـەتـا ] ئـــەو موحاکەمەیە کە لە خوێنا ئەکرێ •

تیرمذیی لە ئیبنوعومەرەوە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ریوایەت ئـەکـا نەمانی دنیا لای خوا لە کوشتنی موسوڵمان ئەهوەنترە • قەسطەلانیی •

لە حوقووقی ناسا ئەوەڵ موحاکەمە خوێنە لە ( حقوق الله )دا نوێژە •

٣٨٩٠/٣٠ ـ أبو هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] يقول : قال أبو القاسم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : من أشار إلى أخيه بحديدة فإن الملائكة تلعنه حتى [ يدعه • نووي ] وإن كان أخاه لأبيه وأمه ! م ـ ١٠/٥٢ •

## تەرجەمە :

کەسێ ئیشارەی برای خـۆی بکا بە شتێکی تیژ تـا وازی لێ یێنێ مەلائیکە لەعنی لێ ئەکا با برای دایکیو باوکیشی بێ !

٣٨٩١/٣١ ـ أبو هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] قال رسول الله [ صلى الله تعالى عليه وسلم ] : لا يشير أحدكم إلى أخيه بالسلاح ؛ فإنه لا يـدري أحدكم لعل الشيطان ينزع في يده فيقع في حفرة من النار م ـ ١٠/٥٣ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : هیچ کەسێ لە ئێوە بە سـیلاح ئیشارەتی برای دینیی خـۆی نەکا ، چـــونکی نازانێ بەڵـکو

شەیتان سیلاحەکەی لە دەستی رائەکێشێ بۆ ئەو کەسەو ئەیکوژێ ئەکەوێتە چاڵێکی ئاگرەوە •

٣٢/٣٨٩٢ - عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - قال : كانت في بني إسرائيل قِصاص" [ أي مُماثَلة" ، ولذا أُنِّث ] ولم تكن فيها الدية ، فقال الله [ تعالى في كتابه ] لهذه الأمة : [ كتب عليكم القصاص في القتلى )[١] إلى هذه الآية [ تمامها : الحر بالحر والعبد بالعبد ، والأنثى بالأنثى ؛ فمن عفي له من آخيه شيء فاتباع بالمعروف وأداء إليه بإحسان ، ذلك تخفيف من ربكم ورحمة ، فمن اعتدى بعد ذلك فله عذاب أليم ] قال ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] : فالعفو أن يقبل الدية في العمد • قال فاتباع بالمعروف : أن يطلب بمعروف ويؤدي [ القاتل الدية ] بإحسان ح - ٤٩/١٠ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : لە بەنیئیسرائیلا قیصاص بوو دیە نەبوو ئەیشڵێن لە شەریعەتی عیسادا - صلى الله تعالى عليه وسلم - دیە بوو قیصاص نەبوو ، ئەگەر وابێ شەریعەتی ئێمە جامیعی هەردوو لایە • قەسطەلانی • خوای تەعالا بۆ ئەم ئوممەتە فەرمووی : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە قیصاصتان لەسەر نووسراوە لەسەر ئینسانکوشتن: حورِ بە حورِ ئەکوژرێتەوە ، عەبد بە عەبد ئەکوژرێتەوە ، ژن بە ژن ئەکوژرێتەوە ••• هەرکەسێ لە طەرەفی برای خۆیەوە شتێکی لێعەفو بکرێ ئیبنوعەباس ئەفەرموێ : لە عەمدا دیەی لێ قەبووڵ بکرێ ، کە دیەی لێقەبووڵ کرا بەخۆشیی طەلەبی دیەتەکە لە قاتیلەکە بکا،قاتیلەکەیش بە خۆشیی دیەتەکەی بداتێ • ئەم دیەتقەبووڵکردنو عەفوکردنە

(١) البقـرة / ١٧٨ .

سووكيىو رەحمەتێكە لە طەرەفى خواى ئێوەوە بە ئێوەى كردوە ، دواى عەفوو ديیەت هەركەسێ تەجاوز بكا [ يـەعنى وەرەثـەى مەقتوولەكـە یێن قاتیلەكە يا كەسێكى ترى بكوژنەوە ] ئەو كەسە عەذابێكى بـە شيددەتـى هەيـە لـــە ئـاخيرەتا •

پياو بە ژن ئەكوژرێ ، بە عەبد ناكوژرێ • بە ئەحاديثى تر ثابتە •

٣٨٩٣/٣٣ ـ عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] أن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : أبغض الناس إلى الله تعالى ثلاثة : ملحـد فـي الحرم ، ومبتغ في الاســـلام سنة الجاهلية ، ومطّلب دم امرىء بغير حق ليهريق دمـه ح ـ ١٠/٥٠ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ فەرمووى : مەبغووضترينى خەڵق لاى خوا ـ عز وجل ـ سێ كەسە : كەسێ لە حەرەما ئيلحاد بكا [يەعنى شتى خراپ بكا ، زوڵمێ بكا ] دوەم كەسێكە لە ئيســـــلامەتيدا عادەتى جاهيلييەت بەجێبێنێ • سێيەم كەسێكە شوێن خوێنى پياوێ بكەوێ بـە ناحەق تا خوێنى بـرێـژێ •

لە خەصائيصى حەرەمى مەككەو مەدينەيە گـــوناهى بوچووكى تيـا گـــەورە بيـێ •

**الاقرار في الحدود وشهادة المظلوم(١) :**

٣٨٩٤/٣٤ ـ أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن يهوديا قتل جارية على أوضاخ [ حلي من فضة ] لها قتلها بحجر [ رض ، دق ، رأس جـاريـة بين

(١) دانپيانان لە حودووداو شايەتيى ستەملێكراو .

حجرين • أخرى خ ] فجيء بها إلى النبي - صلى الله تعالى عليـه وسلم - وبها رمق ، فقال : أقتلك [ فلان قتلك ؟ فرفعت رأسها ، فأعاد عليها ، قال : فلان قتلك ؟ فرفعت رأسها • فقال لها الثالثة : فلان قتلك ؟ فخفضت رأسها • فدعا بـه رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - فقتله بين الحجرين •أخرى•خ] فأشارت برأسها : أن لا • ثم قال الثانية ، فأشارت برأسها : أن لا • ثم سألها الثالثة فأشارت برأسها : أن نعم • فقتله النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - بحجـريـن ح - ١٠/٤٥ ، ٤٦ ، ٤٧ ، ٥٢ وفيه : فاعتـرف • ح - ٧/٥ ، ح - ٤/٢٢٤ ، د ، ن ، جه م - ٧/١٨٠ ، ١٨١ فأمر به أن يرجم بالحجـارة حتى يموت ، فرجم حتى مات •

## تەرجەمە :

پیاوێکی جوولەکە لەسەر خشڵێکی زیو کچە موسوڵمانێکی کوشت؛ سەری خستە بەینی دوو بەردو پانیکردەوە • کچەکەیان بردە خزمەت پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - رۆحی تیامابوو ، لێیپرسیی : فلان تۆی کوشتوە ؟ بەسەر عەرزیکرد : خەیر • دووبارە لێیپرسییەوە ، بەسەر ئیشارەتی کرد : خەیر • دەفعەی سێیەمیش فەرموویەوە ، بەسەر ئیشارەتیکرد : بەڵێ • جوولەکەکەی طەڵەبکرد ، هێنایانو ئیقراری کردو سەری لە بەینی دوو بەردا پانکردەوەو کوشتی • بە دوو بەرد کوشتی • فەرمووی : تا ئەمرێ بە بەرد رەجمی بکەن ، رەجمیانکرد تا تۆپی (روایات)

٣٨٩٥/٣٥ - عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] عن النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : هذه وهذه سواء ، يعني الخِنصـر والإبهـام ح - ١٠/٥٦ ، د ، ت ، ن ، جه •

## تەرجەمە :

فەرمووی : ئەمەو ئەوە وەکو یـــەکن ، یەعنی ئەنگوســـتە تووتەو کەڵەئەنگوست بەرابەرن لە دییەتا •

نەسائی : پەنجەو ددان بەرابەرن ، ددانی پێشەوەو خرێ بەرابەرن ، هەر پەنجەی دە وشتر خوێنیەتی •

ترمذیی و ، د : پەنجەی دەستو پێ بەرابەرن •

جە : پەنجە هـەمـوو بەرابەرن هـەر یـەکێکی دە وشتر خـوێنیەتـی • قەســــــطەلانی •

٣٨٩٦/٣٦ ـ شەعبیی : دوو پیـاو شەهادەتیان دا لەسەر پیاوێ کـە دزیی کردوە ، ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەستی بڕی ، لە پاشـــا پیاوەکان یەکێکی تریان هێنا عەرزیان =کرد= : بەخەطا چووین [ دز ئـەو نەبوو ئەمە بوو ] ئیمامی عـەلی ـ رضـي الله تعـــالى عنـــە ـ بۆ ئەم پیاوە شەهادەتەکەی رەدکردنەوەو دیەتی پیاوە دەستبڕاوەکەی لەو شاهیدانـە سەند ، فەرمووی : ئەگەر بمزانیایە کە بە عەمدەن شەهادەتتان لەسەر داوە دەستی هەردوکتانم ئەبڕی ح ـ ١٠/٥٧ •

ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : منالێ بە غیلە بـــە دزییەوە کوژرا [ دایکی ( لاعیەی ) کوڕەکـــەو ، دەستەخوشـکێـکیو ، جارییەکەیو ، پیاوێکی تر (دۆستەکەی =دایکی=) ] ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنە ـ هەموویانی کوشتەوە فەرمووی : ئەگـــەر ئەهلی صـەنعا هەموویان موشتەرەك بوونایە لەو قەتلەدا هەمووم ئەکوشتن ح ـ ١٠/٥٧ •

پیاوەکە کوڕێکی لە ژنێکی تری ئەبێ ئەچێ بۆ تیجارەت ، ژنەکەی دۆستێ ئەگرێ ، بە دۆستەکەی ئەڵێ : ئەمە ئابڕوومان ئەبا بیکوژە ، ئەڵێ:

نایکوژم ، ئەڵێ : منیش هیچت نادەمێ . ئەو وەختە ئەو پێنج شەش کەسە ئەیکوژن . پارچە-پارچەی ئەکەن‌و ئەیخەنە توورەکەیێکەوەو ئەیشارنەوە ئەیخەنە بیرێ . دۆستی ژنەکە ئەگرن ئیقرار ئەکا ، ئەوانی تریش هەموو ئیقرار ئەکەن . یەعلا کە ئەمیری صەنعاء ئەبێ بۆ حەزرەتی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەنووسێ ، ئەمری پێ‌ئەفەرموێ : هەموویان بکوژەوە ، وەڵڵاهی ئەگەر ئەهلی صەنعاء ...إلخ قەسطەلاني .

٣٧/٣٨٩٧ - ( أثـر ) ئەبوبەکرو ئیبنوزوبەیرو عەلی - رضي الله تعالى عنهم - قیصاصیان لەسەر زللەیێ سەندوە . عومەر - رضي الله تعالى عنه - لەسەر قەمچی‌یێ قیصاصی سەندوە . عومەری کوڕی عەبدولعەزیز - رضي الله تعالى عنه - نووسي بۆ عەدیی کوڕی ئەرطات کە کردبووی بە ئەمیری بەصرە دائیر بە پیاوێکی کوژراو کە لای ماڵێ لە ماڵانی کافرۆش دۆزرابوەوە: ئەگەر کەس‌و کاری ئەو کوژراوە بەیینەیان بوو باشە ، ئەگەر نەیان‌بوو زوڵم لە کەس مەکە ، ئەمە شتێکە تا رۆژی قیامەت حوکمی پێ ناکرێ ح - ١٠/٥٨ ، ٥٩ .

ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - لە سێ قەمچی قیصاصی سەندوە. شورەیحی قازیی لە قەمچێك‌و رووشانێکا قیصاصی سەندوە ئیبنو ئەبی‌مولەیکە ئەفەرموێ : موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان بە واسیطەی قەسامەوە قیصاصی نەستەندوە ح - ١٠/٥٨ .

[ خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پیاوێ لە ئەنصار پیاوێکی لە بەنی‌عەجلان کوشت ، شاهیدی نەبوو [ لوث ، لطخ ] تێوەدانیشیان[1] نەبوو ، خەڵق ئیتتیفاقیان لەسەر

(١) دەکرێ لێرەدا بگوترێ : بەڵکو شوێنەواریش نەبوو .

ئەوە کرد کە واریثی مەقتوولەکە سوێند بخۆن‌و =قاتیلەکەیان= تەسلیم بکرێ‌و بیکوژنەوە • بۆ ئەوە چوومە لای موعاویە ، نووسي بۆ سەعیدی کوڕی عاص – رضي الله تعالى عنه – : ئەگەر ئەو ئیتتیفاقی خەڵقە کە خاریجە ئەیڵێ حەق بێ ئەوی ئەوان ئەیڵێن بیکە • خاریجە ئەفەرموێ : کاغەزەکەی موعاویەم دا بە سەعید – رضي الله تعالى عنه – ئێمە پەنجا سوێندمان خواردو =قاتیلەکەیان=[1] داینێ قەسطەلاني ] •

فەقەط نووسین‌و ئەمری موعاویە ئیعتیباری پێ نیەو بێ قیمەتە • دائیر بە قەسامە حەدیثی حوەیصەو موحەیصە لە ( سیر )ا نووسراوە (فراجعه)[2] ح – ۱۰/٦٠ لە جێی ترا ئیعادەی لازم نیە •

**قەسامە :**

۳۸/۳۸۹۸ – ئەبوقەلابە – رحمه الله تعالى – ئەفەرموێ : عومەری کوڕی عەبدولعەزیز – رضي الله تعالى عنه – ڕۆژێ کورسیەکەی بردە دەرێ کە قسە بۆ خەڵق بکا ، ئیذنی دا ، خەڵق چوونە خزمەتی ، فەرمووی : چی ئەڵێن دەرحەقی قەسامە ؟ یەکێ عەرزی‌کرد : قەسامە حەقە ، خولەفا بە قەسامە حوکمیان کردوە [٠٠ ٠٠٠] عومەری کوڕی عەبدولعەزیز – رضي الله تعالى عنه – فەرمووی : ئەی ئەبوقەلابە تو ئەڵێی چی ؟ عەرزم‌کرد : ( یا أمیر المؤمنین ) ڕوئەسای لەشکرو ئەشرافی عەرەبت لە خزمەتایە خەبەرم بدەرێ ئەگەر پەنجا کەس لەمانە شەهادەت بدەن لەسەر پیاوێکی موحصەن

(۱) دانەر – خ – لە دوو جێگەدا ( مقتول )ی نووسیبوو ، بە هەڵەمان زانی‌و کردمان بە ( قاتیل ) .

(۲) باسی قەسامە لە ل : (۱۱۸)ی بەرگی چوارەمی ئەم کتێبەدا نووسراوە ، بەڵام ئەو حەدیثە ، یان ئەو ئەثەرە ، کە لەوێ نووسراوە ناوی ( حوەیص )و ( موحەیص )ی تێدا نیە .

که له دیمەشقایە زینای کردوەو نەیانبینیوە ‎٠٠‏ تۆ رەجمی ئەکەی؟ فەرمووی: خەیر [ ئەمما شاهیدی زینا ئەبێ کلچێوك له کلتوورا ببینێ ] ئـەبوقـەلابە ئەڵێ : عەرزم کرد : خەبەرم بدەرێ ئەگەر پەنجا کەس لەمانە شەهادەت بدەن لەسەر پیاوێ که له حیمص بێ که دزیی کردوه نەیاندیوە ‎٠٠‏ تـۆ دەسـتی ئەبڕی ؟ فەرمووی : خەیر [ قیاسی لەمەیش ناکرێ چونکی پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - له حەدیثی حوەیصەو موحەیصەدا حوکمی پێ فەرموه ( راجع ح - ‎١٠/٥٩‏ ) ] ئەبوقەلابە عەرزیکرد : وەڵلاهی پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - به واسیطەی سێشت نەبێ هیچ کەسی نەکوشتوه : (١) بـه جینایـەتی خـۆی کوشـتوویەتی (٢) زانـی موحصـەن بـووبێ (٣) موحارەبە لەگەڵ خواو رەسوولی خوا بکاو له ئیسلامەتی وەرگەڕێ ‎•‏ قەومەکە به ئەبوقەلابەیان وت : ئەی ئەنەس - رضي الله تعالی عنه - ریوایەتی نەکردوه که پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - دەسـتی دزی بڕیوەو چاوی کوێرکردوونو لەبەر هەتاوا فڕێیداون ؟ ئەبوقەلابە ئەڵێ : پێموتن: من حەدیثی ئەنەستان بۆ ریوایەت بکەم ؛ هەشت کەس له عوکـل هـاتنـه خزمەت پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - لەسەر ئیسلامەتی موبایەعەیان له خزمەتا کرد ، ئاوو هەوای مەدینەیان پێنەکـەوت ، نەخۆش کـەوتن ، شکایەتیان بردە بەر پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - ئەمری پێفەرموون لەگەڵ شوانەکەیاو وشترەکانی بچنەدەرێ شیرو میزی وشترەکان بخۆنەوە، وتیان : بەڵێ ئەچین ، چوونو چاك بوونەوەو ، شوانەکـەی پێغەمەریان - صلی الله تعالی علیه وسلم - کوشتو وشترەکانیان برد ! که ئەو خەبـەرە بـه پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - گەیییەوە ناردی بـه شوێنیانـا پێیانگەیینو هێنانیانەوە ‎•‏ پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - ئـەمری فەرموو دەستوپێیان بڕینو چاوی کوێرکردنو فڕێیدانـه بەر هەتـاو تـا

ئەتوانێ غەیری حەڵاڵ هیچ نەخوا با بیکا • یەعنی هەر حەڵاڵ بخوا ، کەسێ ئەتوانێ کە مستێ خوێن کە ئەیڕێژێ نەبێ بە مانیع لە بەینی ئەوو بەهەشتا با بیکا ، یەعنی خوێن نەڕێژێ • فەربەریی ئەفەرموێ : لە بوخاریم پرسیی : کێ ئەفەرموێ : لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وســلم ـم بیســـت ؟ جوندوب ؟ فەرمووی : بوخاریی فەرمووی : بەڵێ جوندوب فەرمووی •

[ ظاهیر وایە لێرەوە[1] تا ئاخریی مەوقووف بێو قسەی جونـدوب خۆی بێ • ئەمما چونکی ئەمە شتێکە ئینسان بە عەقڵی خۆی نایزانێ لــە حوکمی مەرفووعایە • لە طەریقێ ترا کە طەبەریی لە ئەبیتەمیمەوە ریوایەتی ئەکا ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعــالی علیـــه وسلم ـ فەرمووی • قەسـطەلانی ] •

٧/٣٩٣٤ ـ محەمــەدی کـــوڕی زەیـــدی کـــوڕی ثابیـت عەرزی ئیبنوعومەری کرد ـ رضي الله تعالی عنهم ـ : ئێمە ئەچینە لای سولطانمان خیلافی ئەوەیان لە لا ئەڵێین کە لە دوای چوونەدەررەوە لە لایان ئەیڵێین • فەرمووی : ئەوەمان بە نیفاق حسیب ئەکرد •

٨/٣٩٣٥ ـ عن زيد بن ثابت [ رضي الله تعالی عنه ] أن النبي ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ أمره أن يتعلم كِتابَ اليهـــود حتی كتبت للنبـي ـصلی الله تعالی علیه وسلمـ كتبه وأقرأته كتبهم إذا كتبوا إليه ح-١٠-٢٤٨•

**تەرجەمە :**

زەیدی کوڕی ثابیت ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : پێغـــەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ ئەمری پێکردم کە خەتی جوولەکە فێر بیم ،

(١) دانەر ـ خ ـ لێرەدا ئیشارەیەکی داناوە کە مەبەستی لەم نووســـینە « ... فقال إن أول ما ينتن من الانسان ... »ە .

فێر بووم تا وام لێهات ئەوی کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بۆی ئەنووسین من بۆم ئەنووسین ، ئەوی ئەوان ئەیاننووسی بۆی بۆم ئەخوێندەوە •

٩/٣٩٣٦ ـ أبو بُردة قال : قال أبو موسى ـ رضي الله تعالى عنه ـ أقبلت على النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ومعي رجلان من الأشعريين أحدهما عن يميني ، والآخر عن يساري ، فكلاهما سأل العمل ، والنبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يستاك ، فقال : ماتقول يا أبا موسى أو يا عبدالله بن قيس ؟ قال : فقلت : والذي بعثك بالحق ما أطلعاني على مافي أنفسهما وما شعرت أنهما يطلبان العمل • قال : وكأني أنظر إلى سواكه تحت شفته وقد قلصت ، فقال : لن أو لا نستعمل على عملنا من أراده ، ولكن اذهب أنت يا أبا موسى أو يا عبدالله بن قيس ، فبعثه على اليمن ، ثم أتبعه معاذ بن جبل [ رضي الله تعالى عنه ] فلما قدم عليه قال : انزل وألقى له وسادة ، وإذا رجل عنده موثق قال : ما هذا ؟ قال : هذا كان يهوديا فأسلم، ثم راجع دينه دين السوء فتهود • قال : لا أجلس حتى يقتل قضاء الله ورسوله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : اجلس نعم • قال : لا أجلس حتى يقتل قضاء الله ورسوله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثلاث مرات فأمر به فقتل • ثم تذاكرا القيام من الليل ، فقال أحدُهما ، معاذ [ رضي الله تعالى عنه ] : أما أنا فأنام وأقوم ، وأرجو في نومتي ما أرجو في قومتي م ـ ٨/٩ من مسألة اليهود مر في الزكاة[١] •

## تەرجەمە :

ئەبوموساى ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هاتە خزمەت پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەفەرموێ : دوو پیاوم لەگەڵ بوو ،

(١) نزیك بەم ریوایەتە لە ل (١٧٤)ی بەرگی هەشتەمدا حەدیثێك رابورد.

یەكێكیان لای راستمەوەو یەكێكیان لای چەپمەوە بوو هەردوكیان داوای مەئموورییەتیان كرد لە خزمەتیا ، پێغەمەر ـ صلی اللە تعالی علیه وســلم ـ سیواكی ئەكرد• فەرمووی : تۆئەلێی چی ئەی ئەبوموسا ، یا فەرمووی ئەی عەبدوللای كوڕی قەیس ؟ عەرزم‌كرد : قەسەم بەو ذاتەی تۆی بـە حـەق ناردوە خەبەریان نەداومێ بەوەی كە لە دڵیانایە ، عیلمم نەبوە بەمە كە داوای وەظیفە ئەكەن • فەرمووی : تەماشای سیواكەكەیم ئەكرد لە ژێر لێویـا ، لێوی موبارەكی وشك هەڵاتبوو [ لەبەر غەضەب لەو داواكردنە ] فەرمووی: قەت من وەظیفە نادەم بە كەسێ داوای بكا • ئەمما ئەی ئەبوموسا ، یـا فەرمووی : ئەی عەبدوللای كوڕی قەیس تۆ بڕۆ ، ناردی بۆ یەمەن ، لـە پاشا مەعاذی دوابەدوا نارد • كە مەعاذ ـ رضي اللە تعالی عنه ـ گەیی‌یە لای فەرمووی : دابەزە ، سەرینێكی بۆ دانا كە لە سەری دانیشێ ، كە تێفكری پیاوێكی لەلا بەسترابۆوە لێی‌پرسیی : ئەمە چیە ؟ فەرمووی : جوولەكەیێكە موسوڵمان بووبوو ئێستە گەڕاوەتەوە سەر دینی خۆی كە دینێكی خراپە، بۆتەوە بە جوولەكە • فەرمووی : دانانیشم تا نەیكوژی بە حوكمی خـواو رەسوولی خوا ـ صلی اللە تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : بەڵێ ئەیكوژم تۆ دانیشە فەرمووی : دانانیشم تا ئەكوژرێ بە حوكمی خواو رەسوولی خوا ـ صلی اللە تعالی علیه وسلم ـ تا سێ جار ، ئەمری فەرموو كوژرا • لە پاشا موذاكەرەیان لە هەڵسانی شەوكرد ، یەكێكیان كە مەعاذە ـ رضي اللە تعالی عنه ـ فەرمووی : من ئەیشنووم‌و هەڵیش‌ئەستم ، لە هەڵسانما چەندم ئومێد هەیە لە نوستنیشما ئەوەندەم ئومێد هەیە بە خوا كە نوستنەكەیشم بـۆ بـە عیبـادەت حسێب كا •

لە ریوایەتێكی ترا ئەفەرموێ : عەرزی پێغەمەریان كـرد ـ صلی اللە تعالی علیه وسلم ـ : ( یا رسول اللە ) شتێكمان پێ بسپێرە كە خوا بە تـۆی

سپاردوه ، فەرمووی : وەڵڵاهی ئەم ئیشە بە هیچ کەسێ ناسپێرم کە داوای بکاو لەسەری حەریص بێ م - ٨/١٢ •

١٠/٣٩٣٧ ـ ( عن أبي ذر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قلت : يارسول الله )[1] بۆ من لەسەر فرمانێ ئیستیخدام ناکەی ؟ بە دەستی موبارەکی بـە شانمیا کێشاو فەرمووی : ئەی ئەبوذەڕ تۆ زەعیفی ، ئەم ئیشەیش ئەمانەتە لە رۆژی قیامەتا ئەبێ بە سەرگەردانیو نەدامەت ، مەگەر کەسێ بە حـەق وەری بگرێو ئەو حەقەی کە لە سەریەتی بەجێی بێنێ م - ٨/١٥ •

١١/٣٩٣٨ ـ وفي أخرى عنه[2] ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەی ئەبوذەڕ من تۆ بە ضەعیف ئەزانم ، چی بۆ خۆم ئەحوبێنم بۆ تۆیشی ئەحوبێنم ؛ قەت ئەمیریی بەسەر دوو کەســا مەکەو قەت ماڵی هەتیو مەگرەرە ژێر دەست م - ٨/١٦ •

١٢/٣٩٣٩ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عومــەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەوانەی کە ئیجرای عەدالەت ئەکەن لە حوضووری خوادان لەسەر مینبەری نوورن ، لە لای راستی خواوە هەردوو دەســتی خوا دەستی ئەوانەیــە کـە لـە حوکمکردنا ئیجرای عەدالەت ئەکەن لەوەیشا کە لە بەینی ئەهلو عەیالیاناو لەوەدا کە بەوان سپێرراوە • م - ٨/١٧ •

١٣/٣٩٤٠ ـ عن عبدالرحمن بن شماسة قال : أتيت عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ أسألها عن شيء فقالت : ممن أنت ؟ فقلت رجل من أهل مصر ،

---

(١) ئەمە تەرجەمەی ســــــەرەتای حەدیثەکەیە : ئەبوذەڕ ئەفەرموێ : وتم : ئەی پێغەمەری خوا ...

(٢) واتە : لە ریوایەتێکی ترا هەر لەوەوە ریوایەت کراوە ...

فقالت : كيف كان صاحبكم لكم في غزاتكم هذه ؟ فقال : مانَقَمنا منــه شيئا ، إن كان ليموت للرجل منا البعير والعبد فيعطيه = البعيرو = العبد ، ويحتاج إلى النفقة فيعطيه النفقة • فقالت : أما إنه لا يمنعني الذي فعل في محمد بن أبي بكر [ رضي الله تعالى عنه ] أخي أن أخبرك ماسمعت من رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ، يقول في بيتي هذا : اللهم من ولي من أمر أمتي شيئا فشقّ عليهم فاشقق عليه • ومن ولي من أمر أمتي شيئا فرفق بهـم فارفق بـه م ـ ١٨/٨ •

## تەرجەمە :

عەبدورەحمانی کوڕی شەماسە ئەفەرموێ : چوومە خزمەت حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ شتێکی لێبپرسم • فەرمووی : تۆ لە کێی ؟ عەرزمکرد : پیاوێکم لە ئەهلی میصر • فەرمووی : لەم غەزایەدا ئەمیرەکەتان چـۆن بـوو بۆ ئێـوە ؟ عەرزمکــرد کــە : ئینتیقـامی[1] هیـچمـان لێ نەستەنـد هی ئـەوە نـەبێ کە =ئەگـەر یـەکێکمـان وشتر یـا بـەنـدەی بمردایـە = وشـ تری ئەدا بە خەڵق ، عەبدی ئەدا بـە خەڵق ، کە موحتاجی نەفەقە بووبایە نەفەقەی ئەدانێ • فەرمووی : خەبەرت بێ ئەوە مەنعی من ناکا کە لەگەڵ محەمەدی براما کوڕی ئەبوبەکرا کردووتانە بێنم خـەبەری ئەوەت نەئەمێ کە لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـم بیستوە • فەرمووی : خوایا هەر کەسێ ئیشێکی لە ئیشی ئەم ئوممەتە تەودیعکـراو زەحمەتی پێگەیانێ تۆیش زەحمەتیان پێبگەیێنە • هەرکەسێ ئیشێکی لە ئیشی ئوممەتی من تەودیع کراو سووکیی‌و موشفیقیی لەگەڵا کردن تۆیش لەگەڵی موشفیق‌و بە مەرحەمەت بە •

---

(١) دانەر ـ خ ـ ئەگەر لێرەدا بینووسـیایە : « هیچ گلەییمان لێی نەبوو ئەوە نەبێ کە ئەگەر یەکێ وشتری یا بەندەی بمردایە وشـترو بەنـدەی ئەدایێ ... » باشتر بوو •

١٤/٣٩٤١ ـ عن ابن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ أنه قال : ألا كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته ؛ فالأمير الذي على الناس راع وهو مسؤول عن رعيته ، والرجل راع على أهل بيته وهو مسؤول عن رعيته ، والمرأة راعية على بيت بعلها وولده وهي مسؤولة عنهم ، والعبد راع على مال سيده وهو مسؤول عنه ، ألا فكلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته م ـ ٨/١٩ والرجل راع في مال أبيه ومسؤول عن رعيته م ـ ٨/٢٠ .

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : خەبەرتان بێ هەمووتان شوانن هەموو لە رەعیەتەکەتان لێ ئەپرسرێتەوە ، ئەو ئەمیرەی کە ئەمیریی بە سەر خەڵقا ئەکا شوانە لە رەعیەتەکەیی لێ ئەپرسرێتەوە ، پیاو شوانە بەسەر ماڵو منالیەوە لە رەعیەتەکەی لێ ئەپرسرێتەوە ، ژن شوانە بەسەر کەس و کاری مێردەکەیەوەو منالەکانیەوە ، لەوانەی لێ ئەپرسرێتەوە . عەبد شوانە بەسەر ماڵی سەییدەکەیەوە لەوە لێی ئەپرسرێتەوە ، خەبەرتان بێ کە هەمووتان شوانن هەمووتان سوئالی رەعیەتەکەتان لێ ئەکرێ . پیاو شوانە لە ماڵی باوکیا لەوە لێی ئەپرسرێتەوە .

١٥/٣٩٤٢ ـ عائذ بن عمرو وكان من أصحاب رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ ورضي عنه ] دخل على عبيدالله بن زياد [ لعنه الله تعالى ] فقال : أي بني إني سمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : إن شر الرعاء الحطمة ، فإياك أن تكون منهم . فقال له : اجلس فإنما أنت من نخالة أصحاب محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فقال : وهل كانت لهم نخالة ؟ انما كانت النخالة بعدهم وفي غيرهم م ـ ٨/٢٢ .

## تەرجەمە :

عائیذی کوڕی عەمر کە لە ئەصحابی پێغەمەربوو - صلی الله تعالی علیەوسلم،ورضي‌عنە-تەشریفی ئەچێتە لای عوبەیدیللای مەلعوونی کوڕی زیاد پێی ئەفەرموێ : ئەی کوڕی خۆم لە پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم-م بیست ئەیفەرموو : خراپترینی شوانانو ئەمیران ئەوانەن کە ئەبن بە گزرەی جەهەنەمو زینهار لەو گزرەیە مەبە[1]! فڵتانی : دانیشە تۆ لە کەپەکی ئەصحابی پێغەمەری - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرمووی : = بۆئە وان کەپەکیان بوە ؟= ئەوان کەپەکیان نەبوە [ هەموویان خالیص بوون ] کەپەك لە دوای ئەوانو غەیری ئەوانا بوە •

وعن جرير - رضي الله تعالى عنه - نحوه ومر في الإيمان[2] •

١٦/٣٩٤٣ - عن عبدالله بن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال : =كنا= إذا بايعنا رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - على السمع والطاعة يقول لنا : فيما استطعت ح - ٢٥٢/١٠ •

## تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : کە موبایەعەمان لە خزمەت پێغەمەرا - صلی الله تعالی علیه وسلم - بکردایە لەسەر قسەبیستنو ئیطاعەتکردن •• ئەیفەرموو : لەوەدا کە بیتوانن •

(١) دانەر - خ - وەك لێرەدا بە هەڵەدا چوویێت وایە ؛ چونتە ( حطة ) مانای گزرە ناگەیێنێ ، رەنگە بە ( حطب )ی زانیبێ . بە گوێرەی نموەویی - خ - ( حطمة ) شوانکارەی خراپەو ، ئەوانەیە بە توندولێژیی لەگەڵ بەردەستانی خۆیانا رەفتار دەکەنو ، پەلەیان لێ ئەکەنو ئەیان فرێننو تێکیان نەشکێنن . مانای ( حطمة )ی سوورەی ( همزه )یش لەمەوە نزیکە •

(٢) حەدیثی ( ٢٠٤/٣٣٦ )ی بەرگی یەکەم نەختێ لەم حەدیثە دەچێت .

١٧/٣٩٤٤ - عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم -: عليك السمع والطاعة في عسرك ويسرك ، ومنشطك ومكرهك ، وأثـرةٍ عليك م - ٨/٣٢ ٠

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - صلى الله تعـالى عليـه وسـلم - فـەرمووی : بیستن و ئیطاعەتکردنت لەسەر لازمە لە تەنگانەو فەرەحییاو ، لەوەدا پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێ و ، لەوەدا کە خەڵقی ترت بەسەرا تەرجیح بدەن ٠

١٨/٣٩٤٥ - يحيى بن حصين قال : سـمعت جدتـي [ أم الحصين أخرى ٠ م - رضي الله تعالى عنها - ] تحدث أنها سـمعت النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - يخطب في حجة الوداع وهو يقول : ولو استعمل عليكم عبد يقودكم بكتاب الله فاستمعوا له وأطيعوا م - ٨/٣٣ ٠

**تەرجەمە :**

یەحیای کوڕی حوصەین ئەفەرموێ : لە ئوممولحوصەینی نـەنکمم بیسـت ئەیفەرموو : لە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسـلم -م بیست لە خوطبەی ( حجة الوداع )ا ئەیفەرموو : ئەگەر عەبدێـکتان بەسـەرەوە مەئموور کرێ کە بە کیتابوڵلاّ ئیدارەتان بکا گوێی لێ بگرن و ئیطاعـەی بکـەن ٠

١٩/٣٩٤٦ - عن أبي ذر [ رضي الله تعالى عنه ] قال : إن خليلي - صلى الله تعالى عليه وسلم - أوصاني أن أسمع وأطيع وإن كان عبدا [ حبشيـا ٠ أخرى ٠ م ] مجمّع الأطراف م ٨/٣٣ ٠

**تەرجەمە :**

ئەبوذەڕ - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : خەلیلم - صلى الله تعالى

علیه وسلم - ئەمری پێفەرمووم گوێبگرمو ئیطاعەت بکەم با ئەمیرەکەم عەبدێکی چوارپەل بڕاوی حەبەشیی بێ •

٢٠/٣٩٤٧ - عن أبي حميد الساعدي قال : استعمل النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - رجلا من الأسد يقال له : ابن الأتبية [ اللتبية •م ] على صدقة [ بني سليم •م ] فلما قدم قال : هذا لكم ، وهذا أهدي لي • فقام النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - على المنبر • قال سفيان [ بن عيينة ] أيضا : فصعد المنبر ، فحمد الله وأثنى عليه • ثم قال : ما بال العامل نبعثه فيأتي يقول : هذا لك وهذا لي ، فهلا جلس في بيت أبيه وأمه فينظرَ : أيهدى له أم لا ؟ والذي نفسي بيده لا يأتي بشيء إلا جاء به يوم القيامة يحمله على رقبته إن كان بعيرا له رُغاء ، أو بقرة لها جؤار ، أو شاة تَيْعر• ثم رفع يديه حتى رأينا عفرتي إبطيه [ بياضهما المشوب بالسمرة ] : ألا هل بلغت ؟ ثلاثا ح - ١٠/٢٣٥ ، ٢٤٥ ، م - ٨/٢٥ ، ٢٧ ، وفيه مرتين • ( دوو حەدیث ) ٢٨ ، ٢٩ •

## تەرجەمە :

ئەبوحەمیدی ساعیدیی - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - پیاوێکی لە ئەسەد کە ناوی ( ابن الاتبيه ) بوو نارد بۆ صەدەقە =ی بەنی سولەیم = کە هاتەوە عەرزیکرد : ئەمە هی ئێوەیە ئەوە هی منە بۆ منیان بە هەدییە هێناوە • پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - تەشریفی سەرکەوتە سەر مینبەر ، حەمدو ثەنای خوای کردو فەرمووی : ئەوانەی کە عامیلن چ حاڵێکیان هەیە ؟ ئەیانێرم بۆ جێبێتو بێنەوە ئەڵێن : ئەمە هی ئێوەیەو ئەمە هی منە ، بۆ لە ماڵی باوکی یا دایکی دانانیشێو تێفکرێ بزانێ هەدییەی بۆ یێ یا بۆی نایێ ؟ قەسەم بەوەی کە رۆحی منی بە دەستە هیچ شتێ ناهێنێ رۆژی قیامەت ئەیهێنێو

ئەیخاتە سەر ملی ئەگەر وشتر بێ لۆغە لۆغە ئەکا ، گاو گۆلك بێ بۆرەبۆر ئەکا ، مەڕ بێ ئەبارێنێ ، لە پاشا هەردوو دەستی هەڵبڕی تا سپیایی هەردوو بنباخەڵمان دی ، سێ جار فەرمووی : ئایا تەبلیغم کرد ؟

دیاریی بۆ مەئموور حەرامە ، مەگەر لە طەرەفی ئەحبابی پێشووەوەی بێو بە سەبەبی مەئمووریيەتەکەیەوە نەبێ ( کما یفهم من متن الحدیث ) •

٣٩٤٨/٢١ ـ عن عدي بن عَميرة الكندي [ رضي الله تعالى عنه ] قال: سمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : من استعملناه منكم على عمل فكتمنا مِخْيَطا فما فوقه كان غلولا يأتي به يوم القيامة =قال:= فقام اليه رجل أسود من الأنصار كأني أنظر إليه• فقال: يارسول الله اقبل عني عملك • قال : وما لك ؟ قال : سمعتك تقول كذا وكذا • قال : وأنا أقوله الآن ؛ من استعملناه منكم على عمل فليجيء بقليله وكثيره • فما أوتي منه أخذ وما نهي عنه انتهى م ـ ٨/٢٩ •

## تەرجەمە :

عەدیی کوڕی عومەیرەی کیندیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ: لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـم بیست ئەیفەرموو : هەر کەسێکمان لە ئێوە لەسەر ئیشێ دانا دەرزیێ یا زیاتر لە دەرزییێکمان لێ بشارێتەوە رۆژی قیامەت ئەیهێنێتەوە • پیاوێکی رەش لە ئەنصار = راویی ئەڵێ : وەك چاوم لێی بێ وایە = هەڵسا عەرزیکرد : ( یا رسول الله ) ئەو ئیشەی کە پێت سپاردووم لێم قەبووڵ بکەرەوە • فەرمووی : بۆ چی لێی رووداوی ؟ عەرزیکرد : واو وام لێ بیستی • فەرمووی : من ئێستەیش وا ئەڵێم ؛ هەرکەسێکمان لەسەر ئیشێ دانا کەمو زۆری بێنێ ، ئەوی لەوە بۆی هێنرا وەری بگرێ ، ئەوی نەهی لێکرا وەری نەگرێ [ یەعنی هەر ئەوە وەربگرێ کە ئەمری پێ ئەکرێ ، زیاد وەرنەگرێ ] •

٣٩٤٩/٢٢ ـ عن أبي سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : ما بعث الله من نبي ، ولا استخلف من خليفة إلا كانت له بطانتان : بطانة تأمره بالمعروف وتَحُضُّه عليه • وبطانة تأمره بالشر وتحضه عليه ؛ فالمعصوم من عصم الله ح ـ ٢٥٠/١٠ •

**تەرجەمە :**

ئەبوسەعیدی خودریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغـەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : خوا هیچ پێغەمەرێکی نەناردوەو هیچ خەلیفەیێکی نەکردوە بە خەلیفە کە دوو رەفیقی باطینیی نەبێ یەکێکیان [مەلائیکەیەو] ئەمری بە چاکە پێ‌ئەکاو لەسەر چاکە تەرغیبی ئەکا• یەکێکیان [ شەیطانەو ] بەشەڕ ئەمری پێ ئەکاو لەسەر شەڕ تەرغیبی ئەکا • مەعصووم ئەوەیە کە خوا لە خراپیی موحافەظەی بـکا [ ئێـســـتە شـەیتان هەموو لەشکرەکەی ئیستیلا کردوە ، مەلائیکە بە تەنها ماوەتـەوە هیـــچی پـێ ناکرێ • والله المستعان على ذلك ] •

**القضـــاة والحـكام(١) :**

٣٩٥٠/٢٣ ـ موزاحیمی کوڕی زوفەر ئەفەرموێ : عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی‌فەرموین : پێنج شت کە قاضیی لـە یەکێ لەوانەدا بە خەطا چوو ئەبێ بە گوناه بۆی : ئەبێ حەلیم بێ‌و ، بـە عیففەت بێ‌و ، مەتانەتی ببێ ، عالم بێ‌و ، زۆر لـە عیـــلم بپرســـێ ح‌ـ٢٢٦/١٠ •

٣٩٥١/٢٤ ـ حەسەنی بەصریی ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : خـوا ـ عز وجل ـ لە سەر حاکمان وای فەرزکردوە کە تابیعی هەواو هـەوەس

(١) باسی قاضیی‌و حاکمەکان‌و مەرجی دادگەریی •

نەبن ، لە کەس نەترسێ ، ئایاتی خوا بە بەهایەکی کـــەم نەفرۆشێ [ وەك بەرتیل ] لە پاشا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ؛ مەئالی : ئەی داوود ئێمە تۆمان کرد بە خەلیفە لە ئەرزا ، لە بەینی خەڵقا حوکم بە حەق بکە ، تابیعی هەواو هەوەس مەبە کە لە ڕێی خوا لات بدا ، ئەوانە کە لە ڕێی خوا لا ئەدەن لـە ڕۆژی حیسابا بە سەبەبی ئەمەوە کە ئەحکامی خوایان لـە فکر چـــۆتەوە عەذابێکی زۆر بە شیددەتیان هەیـە •

هەم ئەم ئایەتەیشی خوێندەوە کە مەئالی وایە : ئـــەفەرموێ : ئێمـــە تەوراتمان نازڵ کرد هیدایەتی تیایە ، نووری تیایە ، پێغەمەران کە ئینقیادی ئەحکامی خوا ئەکەن ، حوکمی پێ ئەکەن بۆ ئەوانەی کـــە هیـدایەتیان دراوەو تەوبەیان لە کوفر کردوە •• ئەوانەیش حوکمی پێ ئەکـــەن کـە عولەمای ڕەببانیو زاهیدنو عالمن حوکم بەو کیتابوڵلایە ئەکەن کە پێیـان تەودیع کراوەو ، شاهیدو حافیظی ئەو کیتابوڵلاهەن ، لە ئینسان مەترسن [ کە ئەحکامی کیتابوڵلا بگۆڕن ] لە من بترسن ئایاتی من بە بەهایێکی کەم مەفرۆشن ، هەرکەسێ حوکم نەکا بەوەی کە خوا نازڵی فەرموە ئـەوانـە کـافرن ( مائیـدە ) •

[ ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەوی ئینکاری بکاو حوکمی پێ نەکا ـ وەك ئەکثەری حوککامی ئێستە ـ ئەوە کافرە ، ئەوی ئینکاری نەکاو حوکم بە خیلافی بکا ـ وەك منو ئەمثـالی من(۱) ـ ئەوە فاسقو زاڵمە • مائیدە ] •

حەسەنی بەصریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم ئایەتەیشی خوێندەوە کە مەئالی وایە : ئەی محمد داوودو سولەیمانیش ذیکر بکە کە لە زەراعەتێکـا

(۱) مەبەستی ئەوەیە کە کاتی خۆی حاکم بوە ، بەڵام کاتێ ئەمەی نووسیوە خانەنشین بوەو پەیوەندیی بە حوکمو فەرمانڕەواییەوە نەبوە .

حوكميان ئەكرد كە مەڕی قەومێكی تێكەوتبوو [ بە شەو خواردبوويـانو شێلابوويان ] ئێمەيش عالم بووين بە حوكمەكانيان [ داوود ـ عليه السلام ـ حوكمی بەمە كرد كە مەڕەكە بدرێ بە صاحێب زەراعەتەكە قيمەتی مەڕەكان بە قەد نوقصانی زەراعەتەكە بوو • سولەيمان ـ عليه السلام ـ عومری يانزە ساڵ بوو عەرزی باوكی كرد : كە غەيری ئەم حوكمە بۆ هەردوو لا باشترە• داوود ـ عليه السلام ـ سوێندی لەسەر ـ سولەيمان ـ عليه السلام ـ خوارد ئەبێ تۆ حوكميان بۆ بكەی • سولەيمان ـ عليـــه الســـلام ـ فەرمووی : وا بە مەصڵەحەت ئەزانم مەڕەكان بدەی بە صاحێب زەراعەتەكە بـە شيرو بەرخو خورييان موتتەفيع بێ ، زەراعەتەكەيش بدەی بە صاحێب مەڕەكان تـا پێتەوە سەر حاڵی ئەو وەختە كە مەڕەكانی تێكەوتبوو ، لـــە پاشـــا هەردوو طەرەف ماڵی خۆيان بۆ رەدبكرێتەوە • داوود ـ عليـه الســلام ـ بە سولەيمان ـ عليه السلام ـی فەرموو : حوكم ئەو حوكمەيە كـــە تـۆ كردت ، بەو نەوعە حوكمی پێ فەرموو قەسطەلاني ] • خوا ـ عز وجـل ـ ئەفەرموێ : كەيفيەتی حوكمەكەمان تەعليمی سولەيمان كرد ، هەردوكيانمان تەعليمی حوكمو عيلم كرد • ( الأنبياء ) •

حەسەنی بەصريی ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : خوا ـ عز وجـل ـ حەمدی سولەيمانی كرد [ كە ئيصابەتی كردبوو ] داووديشی لەوم نـەكرد [ عليهما السلام ] •

ئەگەر حوكمی ئەو دوو پێغەمەرە ـ عليهما الصلاة والسلام ـ نەبوايە رەئيم وا ئەبوو كە هەموو قاضيێ كە لە حوكما بە خەطا بچێ بـە هيـــلاك ئەچن ، خوا ـ عز وجل ـ ثەنای لەسەر ئەم كرد بە واسيطەی عيلميەوەو ، ئەوی بە مەعذوور گرت بە واســـيطەی ئيجتيهاديـەوە ح ـ ١٠/٢٢٥ إلى ٢٢٦ •

شورەیحی قاضي ـ رحمه الله تعالى ـ لەســەر حوكمكردن ئوجرەتی وەرەگرت • عايشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : وەصيــی بـەقـەد زەحمەتی خۆی له ماڵی هەتیو ئەخوا • ئەبوبەكرو عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ له بەیتولماڵیان خواردوە ح ـ ١٠/٢٢٧ •

عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ له مەســـجیدی نەبەویدا حوكمی بـە مولاعەنە كردوە لای مینبەری پێغەمەرەوە ـ صلى الله تعالى عليه وســلم ـ شورەیحو شەعبیو یەحیای كوڕی یەعمور له مەسجیدا حوكمیان كردوە • حەسەنی بەصریو زورارەیكوڕی =ئەبو=ئـەوفا ـ رحمهما الله ـ لــەو رەهرەوەدا كه خاریجی مزگەوته حوكمیان كردوە ح ـ ١٠/٢٢٨ •

عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەگەر خەڵق ئەڵێن عومەر له قورئانی زیادكردوە به دەستی خۆم ئایەتی رەجمم لـه قورئانا ئەنووسـی ح ـ ١٠/٢٣١ • [ پیاوێ شورەیحی قاضي كرد به شاهیدی شتێ له پاشـا خەصمەكەی هێنایه لا ئیقامەی دەعوای لاكرد ] شورەیح فەرمووی : بچۆره لای ئەمیر تا پێم له لای ئەو شەهادەتت بۆ بدەم ح ـ ١٠/٢٣١ •

( عن عكرمة ) عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ به عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوفی فەرموو : ئەگەر چاوت بكەوێ به پیاوێ كه زینا یا دزیــی بكـا ، تۆیش ئەمیر بی [ ئیقامەی حەددی لەسەر ئەكەی یان نا ؟ فەرمووی : خەیر تا لەگەڵ من غەیری منیش شەهادەت بدا ] عومەر ـ رضي الله تعالى عنــه ـ پێیفەرموو: شەهادەتی تۆ شەهادەتی پیاوێكه له موسوڵمانان• عەبدوڕەحمان به عومەری فەرموو ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : وایه راسـت ئـەفەرموێ ح ـ ١٠/٢٣١ • [ مونقەطیعه چونكی عەكرەمەی راویی نـــه عومەر نـــه عەبدوڕەحمانی دیوه ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ] •

ئەهلی حیجاز ئەفەرموون : حاکم بە عیلمی خۆی حوکم ناکا [ لەبـەر توهمەت ] حەزەکا لە زەمانی ویلایەتیا بی‌بینێ یا لە پێشا • ئەگەر خەصم لای حاکم لە مەجلیسی قەزادا ئیقرار بکا بە حەقێ بۆ کەسێ بەعزێك ئەڵێن حوکمی پێ ناکا تا دوو شاهێد یێنێ حازری ئیقراری خەصمەکەی ئـەکـا ح ـ ۱۰/۲۳۲ •

بەعزێ لە ئەهلی عێراق [ کە ئەبی حەنیفەو ئەتباعیە ـ رحمهم الله ـ ] ئەفەرموون : ئەوی قاضي لە مەجلیســی قەضایا ئەیبیێو ئەیبینێ حوکمی پێ ئەکا • ئەوی لە غەیری قەضادا بێ حوکمی پێ ناکا تا دوو شاهید نەبێ • بەعزێ لە ئەهلی عێراق [ کە ئەبو یوسفو ئەتباعیە ـ رحمهم الله تعالی ـ ] ئەفەرموون : حوکمی پێ ئەکا ؛ چونکی ئەمینە مەقصوود لــە شـەهادەت مەعریفەتی حەقە ، عیلمی حاکمان لە عیلمی شاهید زیاترە • بەعزێ لە ئەهلی عێراق ئەڵێن : لە ئەموالا حوکمی پێ ئەکا ، لە غەیری ئەموالا حوکمی پـێ ناکا ، قاسمی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق [ رضي الله تعالی عنه ] ئەفەرموێ : لایەق نیە بۆ حاکم کە بە عیلمی خۆی حوکم بکا ، مەگەر عیلمی غەیریشی لەگەڵا بێ با عیلمی خۆی زیاتر بێ لە عیلمێ کە بە شەهادەتی غەیر ئەبێ ؛ چونکی خۆی ئەخاتە مەعرەضی تـوهمـەتی موســوڵمانان ، ئەیانخاتە ئــەوە کـە ظەنتــی خـراپـی پێ ببەن ح ـ ۱۰/۲۳۲ ، ۲۳۳ • حـەدیثـی /۲ •

**چوونی حاکم بۆ سەر دەعوەت :**

ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئیجابەتی دەعوتی عەبـدێـکی موغیرەی کوڕی شوعبەی کرد ح ـ ۱۰/۲۳٤ •

عەبدوڵلای کوڕی دینار ـ رحمه الله تعالی ـ ئەفەرموێ : کـە خەڵق ئیتتیفاقیان لەسەر عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانکرد [ کردیـان بـە قەراڵی

شـام ] حازری ئیبنوعومەر بووم ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بۆ عەبدولمەلیکی نووسیی : کە ئیقرار ئەکەم بەمە ئەبیێمو ئیطاعەت ئەکـەم بۆ عەبدولمەلیك کە ...ئەمیری موسوڵمانە لەسەر سوتنەتی خواو رەســوولی خوا [ کـە فەرموویانـە : هەرکەسێ بوو بە ئەمیرتان ئیطاعەی بکەن با ماڵتان غەصب بکاو ، بە دار لە پشتتانَ بدا ، ( ســبق في الفتنـة )[1]] تا لە تاقەتما بێ کوڕەکانیشم ئیقرار بەوە ئەکەن [ ... .. ] .

٣٩٥٢/٢٥ ـ وائل الحضرمي [ رضي الله تعالى عنه ] قال : سأل سلمة بن يزيد الجعفي [ رضي الله تعالى عنه ] رسول الله ـ صلى الله تعــالى عليـه وسلم ـ فقال : يا نبي الله أرأيت إن قامت علينا أمراء يسألونا حقهم ويمنعونا حقنا فما تأمرنا ؟ فأعرض عنه . ثم سأله فأعرض عنه ، ثم سأله في الثانية أو في الثالثة فجذبه الأشعث بن قيس [ رضي الله تعـالى عنه ] وقـال : اسمعوا وأطيعوا ؛ فإنما عليهم ماحُمِّلوا وعليكم ماحُمِّلتم م ـ ٨/٤٥ . وفي أخرى: فجذبه الأشعث بن قيس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : اســمعوا وأطيعوا فإنما عليهــم ماحُمِّلوا وعليكـم ماحُمِّلتم م ـ ٨/٤٥ .

## تەرجەمە :

وائیلی حەضرەمیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : سەلەمەی کوڕی یەزیدی جەعفیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليــه وسلم ـی پرسیی : ( یارسول الله ) خەبەرم بدەرێ : ئەگەر بەعزێ ئومەرامان بەسەرەوە وەستا ئەوان حەقی خۆیان لە ئێمە طەڵەب ئەکەن حەقی ئێمە نادەن بە چی ئەمرمان پێ ئەفەرمووی ؟ پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ رووی

(١) بڕوانە لاپەڕە (١١٢)ی بەرگی سێیەمی ئەم کتێبە .

لێ وەرگێڕا • دووبارە لێیپرسیی ، دیسان رووی لێ وەرگێڕا ، دیســان لێی پرسیی ، لە دەفعەی دوەما بوو یا لە دەفعەی سێیەما بوو ئەشعەثی کوڕی قەیس ـ رضي الله تعالى عنه ـ رای کێشایەدواوە • پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەمریان ببیێنو ئیطاعەیان بکەن ، ئەوان ئەوەیان لەسەرە کە لەسەریان دانراوە ، ئێوەیش ئەوەتان لەسەرە کـە لەسەرتان دانراوە [ یەعنی ئەوان ئەوی لەسەریان فەرز بوو نەیانکرد لازم نـایێ کە ئێوەیش تەرکی ئەوە بکەن کە لەسەرتان فەرزە • صەبر لەســەر زوڵمیان بکەن تا خوا حەقتان ئەستێنێ • ئیختیلالو فەساد مەکەن • خورووجی (على السـلطان ) بایەزید یا عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانیش بۆ دروسـت نیە ؛ چونکی فەسادی لێ پەیدا ئەبێو ئیسلامی پێ زەعیف ئەبێ ] •

عن أبي حازم قال : قاعدت أبا هريرة [ رضي الله تعالى عنه ] خمس سنين فسمعته يحدث عن النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قــال : كانت بنــو إسرائيل [ مر في بني إسرائيل فراجع ][1]

٢٦/٣٩٥٣ ـ عن نافع ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن معتقه ـ رحمه الله تعالى ـ قال : جاء عبدالله بن عمر إلى عبدالله بن مطيع ـ رضي الله تعالى عنهم ـ حين كان من أمر الحرّة ما كان زمن [ الملعون ] يزيـد بن ••• معاويـة • فقال : اطرحوا لأبي عبدالرحمن وسادة ، فقال : لم آتـك لأجلس ، أتيتك لأحدثك حديثا سمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقــولـه • سمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : من خلع يدا من طاعة لقي الله تعالى يوم القيامة لا حجة له • ومن مات وليس في عنقه بيعـة مـات ميتـة جاهلية م ـ ٨/٥٠ •

---

(1) لە باسی بەنی ئیسرائیلدا ـ کە لە سەرەتای بەرگی پێنجەمدایە ـ بـۆی گەڕام نەمدۆزییەوە .

## تەرجەمە :

نافیع ئەفەرموێ : عەبدوڵلای کوڕی عومەر تەشریفی چوە لای عەبدوڵلای کوڕی موطیع لە زەمانی وەقعەی حەڕڕەدا کە لە طەرەفی یەزیدی لەعینەوە بوو • عەبدوڵلای کوڕی موطیع فەرمووی : پشتییێ داتێن بۆ ئەبوعەبدوڕەحمان - رضي الله تعالى عنهم - فەرمووی : بۆیێ نەهاتووم کە دانیشم ، بۆیێ هاتووم حەدیثێکت بۆ ریوایەت کەم کە لە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم -م بیستوە کە ئەیفەرموو : هەرکەسێ دەستی لە ژێر ئیطاعەت دەرهێنێ رۆژی قیامەت ئەچێتە حوضووری خوا هیچ دەلیلی بە دەستەوە نیە کە خۆیی پێ نەجات بدا • هەرکەسێ بمرێو بەیعەتی لە گەردنا نەبێ وەك مردووی جاهیلییەت ئەبێ •

٣٩٥٤/٢٧ - عەرفەجە [ رضي الله تعالى عنه ] ئەفەرموێ : لە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - م بیست ئەیفەرموو : لەمەولا فیتنەی واو وا ئەبێ • هەرکەسێ ئیرادە بکا کە تەفرەقە بخاتە کاری ئەم ئوممەتەوە لە وەختێکا کە موتتەفیق بن لەسەر ئیشێ هەرکەسێ بێ •••لە گەردنی بدەن بە شیر [ ئەمما کێ لە خۆی ئەبوورێو ئەو فیداکارییە ئەکا ؟ ]

٣٩٥٥/٢٨ - عەرفەجە [ رضي الله تعالى عنه ] ئەفەرموێ : لە پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم -م بیست : هەرکەسێ بێتە لای ئێوە لە وەختێکا کە هەموو کۆ بن لەسەر پیاوێكو ، ئەو ئیرادەی وابێ کە عەصاتان - ئیتتیفاقتان - لەت بکاو بلاوتان بکاتەوەو جەماعەتتان تێك بدا بیکوژن م - ٥٢/٨ •

٣٩٥٦/٢٩ - ئەبوسەعیدی خودریی [ رضي الله تعالى عنه ] ئەفەرموێ: پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : کە بەیعەت بە دوو خەلیفە کرا خەلیفەی دوایی •••••بکوژن ح - ٥٢/٨ •

٣٩٥٧/٣٠ ـ ئوممو سەلەمەی حەرەمی پێغەمەر ـ صلی الله تعـــالی علیه وسلم ، ورضي عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـــه وسلم ـ فەرمووی : گەلێ ئومەراتان بەسەرەوە دائەنرێ ئیشی چاکیشـیان لێ ئەبینن ، ئیشی خراپیشیان لێ ئەبینن ، هەرکەسێ خراپەکەیان بکەرهێنێ ئەو کەسە لە خراپییەکەیان بەریی ئەبێ • هەر کەسێ ئینکاریان لەسەر بکا [ ئەگەر بتوانێ ] سەلامەت ئەبێ • ئەمما ئەوی رازیی بێو تابیعیـان بیـێ [ یەعنی موعاقەب ئەبێ لە ئاخیرەتا ] عەرزیان کرد : ( یا رسول الله ) ئـەی حەربیان لەگەڵ نەکەین ؟ فەرمووی : خەیر مادام نوێژ بکەن [ یەعنی نوێژ نەکەن بە گژاچوونیان دروستە ، بە شـەرتێ کە فیتنەی لێ پەیدا نـەبێ ] مەعنای بیکەرهێنێ بە دڵ بیکەرهێنێو بە دڵ ئینکاری بکا [ یەعنی کـــە قووەتیان بەسەرا نەشکا بە زمان ئینکاری بکەن ] م ـ ٥٣/٨ •

٣٩٥٨/٣١ ـ ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنە ـ بە وەفدی بوزاخـەی فەرموو : شوێن کلکی وشتر بکەون تا خوا ـ عز وجل ـ رێێ بە خەلیفەی پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـو بە موهاجیرین پێنیشان ئەدا کـە بـەوە مەعذوورتان بکەن ح ـ ٢٦١/١٠ •

[ ئـەم حەدیثە بە موختەصەریی ریوایەتکراوە • ئەصلی وابوە کـە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ وەفاتی فەرموو ( طەیی‌و ،ئەسەدو ، غەطەفـان ••• و ) قەبائیلێکی زۆر مورتەد بوون ، تابیعی طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدیی بوون ، کە لە دوای پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـــە وسلم ـ ئیددیعای پێغەمەرێتی ئەکرد • خالیدی کوڕی وەلید ـ رضي الله تعالی عنە ـ کە لە حەربی موسەیلیمەی کەذذاب بۆوە حەربی لەگەڵ ئەوانیشا کرد ، کە غاڵب بوون بەسەریانا تەوبەیانکرد ، بـەعزێ سوفەرایـان ناردە خزمەت حەزرەتی صەدیقی ئەکبەر ـ رضي الله تعالی عنە ـ ئیعتیذاریان لـە

خزمەتا ئەکرد • حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ حەزی کرد کـە تا موشاوەرە نەکا بە ئەصحابی کیرام حوکم نەکا لە ئیشیانا ، پێی فەرموون: شوێن کلکی وشتر بکەون تا خوا ـ عز وجل ـ ئەمرێ پێنیشانی خەلیفەی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و موهاجیرین ئەدا کە بەوە عوزرتان لێ قەبووڵ بکـا •

[ لەفظی حەدیثەکە ئەوەیە کە حومەیدیی ئەفەرموێ : سەفیری بوزاخە لە ئەسەدو غەطەفان هاتنە خزمەت ئەبوبەکر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ [ی خەلیفەی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ] طەڵەبی صولحیان لێکرد، موخەییەری کردن لە بەینی دوو شتا کە : یا حەربێکیان لەگەڵ بکا کە بێ بە سەبەبی ئیجلایانو دەرهێنانیان لە مەئاڵ [ یەعنی لە سەر ئـــەرزا ماڵیان نەیێڵێ ] یا صوڵحێکیان لەگەڵ بکا بێ بە سەبەبی ذیللەتیان • عەرزیانکرد: حەربی ( مجليه ) ئەزانین چیە ئەمما سیلمی ( مخزيه ) چیـە ؟ فـەرمووی : حەلقەو(۱) ئەسبابی حەربتان هیچ پێ نایێڵین • ئەوی ئێمە بە غەنیمەت لـە ئێوەمان گرتوە تەقسیمی ئەکەین [ لە بەینمانا ] ئەوی ئێوە لە ئێمەتان بـە غەنیمەت گرتوە هەمووی بۆ رەدبکەنەوەو ، خوێنی ئەوانەمان بـدەنێ کە لە ئێمە شەهیدتانکردوە • کوژراوی ئێوەیش لە ئاگرایە • ئـەکرێـن بـە قەومێ کە شوێن کلکی وشتر بکەون تا خوا ـ عز وجل ـ رێیێ بە خەلیفەی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و موهاجیرین پێنیشان ئەدا کە بەوە مەعذوورتان بکـا •

حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم فەرموودەی خـۆیی عەرزی قەومی موهاجیرینو ئەنصار کرد • حەزرەتی فارووقـی ئـەکبـەر

(۱) واتە زرێو چەکی شەرتان پێ نایێڵین •

ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هەڵسا فەرمووی : من رەئییێکم هەیە عەرزتی ئەکەم : کە ئەفەرمووی کوراع‌و حەلقەتـان یەعنـی ئەسبابی حـەربتان لێ نەزع ئەکەم ئەوە بکەو باشە • ئەمما ئـــەوەی کـە ئەفەرمووی : خـوێنی شەهیدەکانمان بدەنێ‌و کوژراوی ئێوە لە ئاگرایە ؛ شەهیدی ئێمە بۆ خوا حەربیان کردوەو ئەجریان لەسەر خوایەو خوێنیان نیـە • خەڵقی تـریش هەموو یەك لە دوای یەك لەسەر فەرموودەی حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قەرارگیر بوون ـ رضي الله تعالى عن جميعهم ـ •

موجلیە : چوونەدەرەوەیە لە جەمیعی مولـك‌و مـاڵ • موخـزیـە : قەرارگرتنە لەسەر ذیللەت‌و سەفالەت کە هیچ قووەت‌و شەوکەتیان نەمێنێ، خەڵق لە حەربیان‌و سەرکەشییان ئەمین بن ، کە شوێن کلکی وشتر کـەوتن ئەبن بە شوانی وشترو ئەبنەوە بە ئەعرابی بادیە نشین ، غەیری وشترەکانیان هیچیان نابێ کە ئیستیفادەی لێ بکەن • قەسطەلاني ] •

٣٩٥٩/٣٢ ـ عن عوف بن مالك [ رضي الله تعالى عنه ] عن رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : خيار أئمتكم الذين تحبونهم ويحبونكم، ويصلون عليكم ، وتصلون عليهم • وشرار أئمتكم الـذيـن تبغضـــونهم ويبغضونكم ، وتلعنونهم ويلعنونكم • قيل : يا رسول الله أفـلا ننابذهـم بالـسيف ؟ قال : لا ما أقاموا فيكم الصلاة [ مرتين • أخرى م ] وإذا رأيتـم من ولاتـــكم شيئا تكرهونـه فاكرهـوا عمله ولا تنزعـوا يـدا من طاعة م ـ ٨/٥٤ •

## تەرجەمە :

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : چاکترینی پێشەوای ئێوە ئەوانەن کە خۆشتان ئەوێن‌و خۆشیان ئەوێن ، رەحمەتیان بۆ ئەنێرن‌و رەحمەتتان بۆ ئـــەنێرن • خراپترینی پێشـــەوای ئێوە ئەوانـــەن کـــە

ئەیان‌بوغضێنن‌و ئەتان‌بوغضێنن ، لە عنەتیان لێ ئەکەن‌و لەعنەتتان لێ ئەکەن. عەرزیان‌کرد : = ئەی پێغەمەری خوا = ئەی بە شیر موقابەلەیان نەکەین ؟ فەرمووی : خەیر مادام نوێژتان لە ناوا بکەن . کە لە ئەمیرتان شتێکتان دی کە بیکەرهێنن عەمەلیان بکەرهێنن ، دەست لە ژێر ئیطاعەیان مەکێشنەوە .

٣٣/٣٩٦٠ ـ أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أخبر أنه سمع خطبة عمر الآخرة حين جلس على المنبر ، وذلك الغد من يوم تـُوفي النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فتشهد وأبو بكر [ رضي الله تعالى عنهما ] صامت لا يتكلم . قال : كنت أرجو أن يعيش رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حتى يَدْبُرَنا [ يُدبّر . إسماعيلي ] يريد بذلك أن يكون آخرهم . فإن يك محمد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قد مات فإن الله تعالى قد جعل بين أظهركم نورا تهتدون به [ وبه ] هدى الله محمدا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وإن أبا بكر [ رضي الله تعالى عنه ] صاحب رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ثاني اثنين ؛ فإنه أولى المسلمين بأموركم ؛ فقوموا فبايعوه ، وكان طائفة منهم قد بايعوه قبل ذلك في سقيفة بني ساعدة ، وكانت بيعة العامة على المنبر . وعنه سمعت عمر يقول لأبي بكر يومئذ : اصعد المنبر ، فلم يزل به حتى صعد المنبر ، فبايعه الناس عامة ح ـ ٢٦١/١٠ .

## تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژی دوای وەفاتی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ گوێم لە ئاخر خوطبەی عومەر بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەو وەختەدا کە تەشریفی لەسەر مینبەر دانیشتبوو [ کأنە ] ئیعتیذاری ئەهێنایەوە بۆ قسەی دوێنێی کە فەرموبووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەفاتی نەکردوەو یێتەوە لامان ] ئەبوبەکریش ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی بێدەنگ بوو قسەی نەئەفەرموو . عومەر

ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئومێدم وابوو کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەژیو ئەکەوێتە دوای ئێمە [ یا فەرمووی : ئەژی تــا تەدبیری ئیشی ئێمە ئەکا ] ئەگەر پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسـلم ـ وەفاتی کردوە خوای تەعالا لە ناوماناا نووری قورئانی داناوە ، ئێـوە بـە قورئان هیدایەتتان ئەبێ ، خوا بـە قورئان هیدایەتی پێغەمەری داوە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ صاحێبی پێغەمەرە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـو دوەمینی ئەوە لە غارا [ کە هیجرەتی فەرموو بۆ مەدینە ] ئەو چاکترینی موسوڵمانانە بۆ ئیشی ئێوە ، هەڵسن بەیعەتی پێ بکەن • طائیفەیێ لە پێشەوە لە ژێر کــەپری بەنی‌ســاعیدەدا بـەیعەتیان پێ‌کردبوو • بەیعەتی عامە لەسەر مینبەر بوو • ئەنەس ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەو رۆژە عومەر عەرزی ئەبوبەکری ئەکرد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە تەشریفت سەرکەوێتە سەر مینبەر ، وازی لێ نـەهێنا تـا تەشریفی سەرکەوت‌و هەموو خەڵق بەیعەتیان پێ کرد •

٣٩٦١/٣٤ ـ عبدالله بن عمر [ رضي الله تعالى عنهما ] قال : قيل لعمـر [ رضي الله تعالى عنه ] : ألا تستخلف ؟ قال : إن أستخلف فقد استخلف من هو خير مني أبو بكر [ رضي الله تعالى عنه ] وإن [ لم أستخلف و ] أتـرك فقد ترك من هو خير مني رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ [ فـأخـذ عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وسطا من الأمر فلم يترك الاستخلاف بمرة ولا فعله بمرة ، بل استخلف واحدا من ستة ] فأثنوا عليه ، فقال : راغب [ في حسن رأي فيه ] وراهب [ من إظهار ما يضمره من كراهية • أو راغب فيما عندي وراهب مني ، أو الناس راغـب في الخـلافــة وراهب منها والمعنى الصحيح : راغب فيما عند الله وراهب من عقابه ] وودت أني نجوت منهـا كفافا لا ليَ ولا عليَّ لا أتحملها حيا وميتا ح ـ ٢٦٠/١٠ ، م ـ ٩/٨ •

## تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : عەرزی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه كرا : یەکێك ناکەی بە خەلیفە ؟ فەرمووی : ئەگەر یەکێ بکەم بە خەلیفە [ سەلەفم هەیە ] ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە لە من چاکتر بوو منی کرد بە خەلیفە •• ئەگەر کەس نەکەم بە خەلیفە لە من چاکتر کە پێغەمەرە ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کەسی نەکرد بە خەلیفە [ ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە بەینی ئەم دوو حاڵەدا مایەوە نە بە موعەیيەنی یەکێکی کرد بە خەلیفە ، نە بە تەواویی تەرکی کرد ؛ ئیستیخلافی کرد بە مەشوەرەت لە بەینی شەش کەسا ] ئەنایانکرد ، مەدحی بەخەیریان کرد ، فەرمووی : رەغبەتو رجام هەیە لای خوا کە عەفوم بکا ، ترسیشم لێی هەیە کە لە قوصوورم لە ئیشی ئومەتا عەذابم بدا •• وا حەزەکەم کە سەربەسەر نەجاتم لە مەسئوولییەتی خەلافەت بێ نە لە (لە)م بێو ثەوابم بێ ، نە لە زەرەرم بێو لە سەری عەذاب بدرێم [ ئەمما وەڵڵاهی لە دوای حەزرەتی صەدیق بە قەد هەموو ئومەت ثەوابی هەیە ] ئیشی خەلافەت بە زیندوویيشو بە مردوویيشم هەڵناگرم نایخەمە سەر خۆم [ یەعنی بە زیندوویی هەڵم گرت ، یەکێك بکەم بە خەلیفە بە مردوویيش هەڵی ئەگرم ، قوصوورێکی بێ لە من ئەپرسرێتەوە ] •

٣٥/٣٩٦٢ ـ وعنه قال : دخلت على حفصة فقالت : أعلمت أن أباك غير مستخلف ؟ ••• إلخ م ـ ١١/٨ •

## تەرجەمە :

ئیبنوعومەر ئەفەرموێ : چوومە لای حەفصە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فەرمووی : ئەزانی کە باوکت کەس ناکا بە خەلیفە ؟ فەرمووی : وتم نابێ وا بکا • فەرمووی : هەر وا ئەکا • ئیبنوعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ

فەرمووی : سوێندم خوارد کە لەم خوصووصەوە ئەبێ قســـەی لـەگەڵ بکەم • تا سبەینێ لێی بێدەنگ بووم‌و قسەم لە خزمەتا نەکرد • وام لێ هات کە بە سەبەبی سوێندەکەمەوە وەکوو شاخێ هەڵبگرم ئەوەندەم لەســـەر شان قورس بوو • بۆ سبەینێ گەڕامەوە بۆ ماڵی باوکم‌و چوومە خزمەتی ، لە خوصووصی ئەحواڵی خەڵقەوە لێی‌پرسیم ، عەرزم‌کردو خەبەرم داپێ • فەرمووی : لە پاشا عەرزم‌کرد کە لە خەڵقم بیستوە قسەیێك ئەکەن سوێندم خوارد کە عەرزت‌بکەم ئەڵێن : کە تۆ کەس ناکەی بە خەلیفە • ئەگەر تـۆ شوانی مەڕ یا شوانی وشترت بێ‌و شوانەکەت بێتە لات‌و وشترو مەڕەکە بەجێ‌بێڵێ بە بـێ صـــاحیب ، وا ئـەزانـی کـە وشـترو مەڕەکـــەتـی بە ضایع داوە ! شوانێتی ئینسان لەوە بەشیددەت‌ترە [ یەعنی تۆ ئـەچیـەوە حوضووری خوا خەڵق بە بێ شوان بەجێ بێڵی بۆ خوا لێت ناپرسێتەوە کە خەڵقەکەت بۆچی بە بێ کەس بەجێ هێشت ] عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعـــالى عنه ـ ئەفەرموێ : قسەکەم موافیقی مەشرەبی بوو ساعەتێ سەری دانا لـە پاشا سەری هەڵبڕی ، فەرمووی : خوا ـعز وجلـ دینی خۆی موحافەظە ئەکا ئەگەر کەسێ نەکەم بە خەلیفە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ کەسی نەکرد بە خەلیفە • ئەگەر یەکێ بکەم بە خەلیفە ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ یەکێکی کرد بە خەلیفە [ کە منم ] ئیبنوعومەر ـ رضـــي الله تعـــالى عنهما ـ ئەفەرموێ : هەر ئەوە بوو کە ناوی پێغەمەری برد ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ و ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیتر زانیم کە هیچ کـەس ناکا بە ئاوتای پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وســـلم ـو کەس ناکـا بـە خـەلیفـــە •

٣٩٦٣/٣٦ ـ عمر بن الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] خطب يوم الجمعة فذكر نبي الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وذكر أبا بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ إلى آخره •••

م ـ ٣/٢٣٥ ئەم حەدیثەم ئەگەر لە مەکرووهاتی صەلاتا نـەنووسیبێ لێـرەدا بینووســـن[١].

عمر بن الخطاب خطب يوم الجمعة فذكر نبي الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وذكر أبا بكر ، قال : إني رأيت كأن ديكا نقرني ثلاث نقرات ، وإني لا أراه إلا حضور أجلي ، وإن أقواما يأمرونني أن أستخلف ، وان الله لـم يكن ليضيع دينه ولا خلافته ، ولا الذي بعث به نبيه ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ فـإن عجل بي أمر فالخلافة شورى بين هؤلاء الستة الذين توفى رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وهو عنهم راض ، وإني قد علمت أن أقواما يطعنون في هذا الأمر أنا ضربتهم بيدي هذه على الإسلام . فـإن فعلوا ذلك فأولئك أعداء الله الكفرة الضلال ، ثم إني لا أدع بعدي شيئا أهم عندي من الكلالة ، ما راجعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في شيء ما راجعته في الكلالة . وما أغلظ لي في شيء ما أغلظ لي فيه ، حتى طعن بأصبعه في صدري وقال : يا عمر ألا تكفيك آية الصيف التي في آخر سورة النساء ؟ وإني إن أعش أقض فيها بقضية يقضي بها من يقرأ القـرآن

(١) دانەر ـ خ ـ وەك دەبینی سەرەتای ئەم حەدیثەی نووسیوەو لە دواییدا دەفەرموێ : « ئەم ... » منیش باسی مەکرووهاتی نوێژو ، باســـی جەماعەتو ، باسی مزگەوت ... گـەڕام نەمدۆزییەوە . دوای ئـەوە گەڕام لە باسی ( کەلالە )دا ریوایەتێکی نزیك بـەم ریوایەتەم دۆزییەوە . کـە حەدیثی ژمـــارە ( ٣٠٣٤/١٢ )ی بەرگی هەشـــــــتەمە ، دوای بەراوردکردنیان دەرکەوت جیاوازییەکی کەمیان لە نێواندا هەیە ودانەر لەوێ عەرەبییەکەی نەنووسیوە ، لێرەدا دەقە عەرەبییەکەو تەرجەمەی زیادەکانیم لەسەرەوە نووسی .

هەروەها دانەر ـ خ ـ ژمارەی چەند حەدیثێکی تری نووسیوەو فەرموویە : « ئەم هەشت حەدیثەیشم ئەگەر نە نووسیبێ بیاننووسن » ئەوا منیش ئەیاننووسم .

ومن لا يقرأ القرآن • ثم قال : أللهم إني أشهدك على أمراء الأمصار • فإني إنما بعثتهم عليهم ليعدلوا عليهم وليعلموا الناس دينهم وسنة نبيهم ويقسموا فيهم فيئهم ، ويرفعوا إلي ما أشكل عليهم من أمرهم • ثم إنكم أيها الناس تأكلون شجرتين لا أراهما إلا خبيثتين : هذا البصل ، والثوم • لقد رأيت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ إذا وجد ريحهما من الرجل في المسجد أمر به فأخرج إلى البقيع ؛ فمن أكلهما فليمتهما طبخا •

= م ـ ٣/٢٢٠ = •

## تەرجەمە :

حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ رۆژیجومعە خوطبەی خوێندەوە ، ناوی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـو حەزرەتی ئەبوبەکری برد • لە پاشا فەرمووی : لە خەوما دیـم کەڵەشێرێك سـێ دەنووکی لێدام • بە نزیکبوونەوەی مەرگم خەوپەرژێنم کـرد • چەنـد کەسێك داوام لێ ئەکەن جێنشین بۆ خۆم دیاریی بکەم • بێگومان خـودا دینو خەلافەتی خۆیو ئەوەی کە پێغەمەرەکەی ـ کە قورئانە ـ پێناردوە •• لەناو نابا • ئەگەر من زوو شتێکم بەسەر هات جێگەداریی بەپرسو را لەناو ئەو شەش کەسەدا بێ کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـمردو لێیان رازیی بوو • من ئەزانم چەند کەسێك هەن کە من بە دەستی خـۆم لەسەرئیسلام لێمداون قسە لەم ئیشەدا ئەکەنو تانەی لێ ئەدەن • ئـەگەر شتی وایان کرد ئەوە ئەوانە دوژمنی خوانو کافرو گومڕان ••• لـە پاشا حەزرەتی عومەر فەرمووی : خوایە تۆ بە شایەت ئەگرم لەسەر فەرمانڕەوایانی شاران ، من بۆیەم ناردوون دادگەرییان لە ناوا بکەنو ، خەڵق فێری دینیانو سونەتی پێغەمەریان بکەنو ، تالانیو ماڵی دەسکەوتەیان بەسەرا دابەش

بکەن‌و ، هەرچیشیان لێ‌گیراو نـەیانزانی بـۆ منـی بنووسـن‌و لێـم بپرسـن •

ئەی خەڵقینە ئێوە دوو سەوزەجات ئەخۆن من بە پیسیان ئـەزانم : پیازو ، سیر • پێغەمەر م - صلی الله تعالی علیه وسلم - دی بۆنی ئەمانەی لە هەر پیاوێ لە مزگەوتا بیبستایە فەرمانی ئەدا دەریان‌ئەکرد بۆ بـەقیع • هەرکەسێ ویستی بیان‌خوا با بە کوڵاندن بیان‌مرێنێ •

م - ٢٦٩/٧ ، ٢٧٢ ، ٢٨٢ ، ٢٨٣ ، ٢٨٤ ، ٢٦٨ ، ٣٨٦ - ٢٨٨ ، ح - ٣٢٩/١٠ ، ٣١٩ ئـەم هـەشت حەدیثـەیشـم ئەگـەر نەنووسـیبێ بینووسـن[1] •

أ - عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنه ] أن رسـول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - قضى بيمين وشاهد م - ٢٦٩/٧ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - بە شایەتێك‌و سوێنی موددەعی حوکمی کردوە •

ب - عن أم سلمة [ رضي الله تعالى عنها ] قالت : قال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - : إنكم تختصمون إلي ، ولعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض ، فأقضي له على نحو مما أسمع منه ، فمن قطعت له من حق أخيه شيئا فلا يأخذه ، فإنما أقطع له به قطعة من النار م - ٢٦٩/٧ •

**تەرجەمە :**

ئوممو سەلەمە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرمووی : ئێوە دەعواو نیزاعتان دێننە لای من ،

(١) ئەوا بە ژمارەیەکی تایبەتی دەیان‌نووسم‌و تەرجەمەیان دەکەم •

لەوانەیە هەندێکتان بە دەمو پلو بەڵگەزانتر بێ لە هەندێکتان ، منیش بە گوێرەی ئەوەی کە لە دەمی قسەزانەکەی ئەبیسم حوکمی بۆ ئەکەم [بەسەر بەرانبەرە بێزمانو ندمەکەیدا ، لە گەڵ ئەوەیشدا حەق هی بێ زمانەکەیە ] جا هەرکەسێ شتێکم لە مافی بەرانبەرەکەی بۆ بڕی با وەری نەگرێ ، چونکە من بەوە پارچەیێ لە ئاگری بۆ ئەبڕم •

ج ـ عن عمرو بن العاص [ رضي الله تعالى عنه ] أنه سمع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قال : إذا حكم الحاكم فاجتهد ثم أصاب فله أجران ، وإذا حكم فاجتهد ثم أخطأ فله أجر م ـ ٧/٢٨٣ •

## تەرجەمە :

عەمری کوڕی عاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێغەمەری ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بیستوە کە فەرموویەتی : ئەگەر حاکم لە حوکما ئیجتیهادی کردو پێکای دوو خێری هەیە ، ئەگەر ئیجتیهادی کردو نەی پێکا یەك ئەجری هەیە •

د ـ عبدالرحمن بن أبي بكرة قال : كتب أبي وكتبت له إلى عبيدالله بن أبي بكرة وهو قاضي سجستان : أن لا تحكم بين اثنين وأنت غضبان ، فإني سمعت رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يقول : لا يحكم أحد بين اثنين وهو غضبان م ـ ٧/٢٨٣ •

## تەرجەمە :

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرە ئەفەرموێ : باوکم پێی نووسیم بۆم نووسی بۆ لای عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرە کە قاضي سەجستان بوو : کە تووڕە بوویت حوکم لە نێوان دووان [ یا زیاتر ]ا مەکە ، چونکە من لە پێغەمەرم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بیست ئەیفەرموو : با یەکێك لە ئێوە حوکم لە نێوان دواندا نەکاو تووڕە بێ •

هـ - عن زيد بن خالد الجهني أن النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : ألا أخبركم بخير الشهداء ؟ الذي يأتي بشهادته قبل أن يسألها م - ٢٨٦/٧ •

**تەرجەمە :**

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ئەفەرموێ : پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : پێتانبڵێم کێ چاکترین شایەتە ؟ چاکترینشایەت ئەو کەسەیە کە پێش ئەوەی داوای لێبکەن بۆ شایەتیی بدا •

و - •• م - ٢٨٨/٧[1]

ز - عن ابن عباس [ رضي الله تعالى عنهما ] أن النبي - صلى الله تعالى عليه وسلم - قال : لو يعطى الناس بدعواهم لادعى ناس دماء رجال وأموالهم، ولكن اليمين على المدعي عليه م - ٢٦٨/٧ •

**تەرجەمە :**

ئیبنوعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - صلى الله تعالى عليه وسلم - فەرمووی : ئەگەر خەڵق لەسەر داوای خۆیان شتیان بدرێتێ [ و حوکمیان بۆ بکرێ ] هەندێ کەس داوای خوێنو ماڵی هەندێ کەسی دیکە ئەکەن ، بەڵام داوا لێکراو سوێنی لەسەرە •

[ بە سوێن دەتوانێ خۆی رزگار بکا ] •

ح - ح - ٣٢٩/١٠ ، ٣١٩[2] •

٣٩٦٤/٣٧ - عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - قال : كنت أقرىء

(١) ئەم حەدیثە بە ژمارە ( ١٥١٠/٢٩ ) لە بەرگی پێنجەمدا رابورد •

(٢) ئەم حەدیثەیش حەدیثی ( ئەجری حاکم )ە کە لێرەدا نووسیمان •

رجالا من المهاجرين منهم عبدالرحمن بن عوف [ رضي الله تعالى عنهم ] فبينما أنا في منزله بمنى وهو عند عمر بن الخطاب [ رضي الله تعالى عنه ] في آخر حجة حجها ... إلى آخره ح - ١٠/١٨ إلى ٢٤ .

## تەرجەمە :

ئیبنوعەباس -رضي‌الله‌تعالی‌عنهما- ئەفەرموێ: بە چەند پیاوێکی موهاجیریی دەرسم ئەخوێند(١)، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف - رضي الله تعالی عنــه - لەوانە بوو کە دەرسم پێ ئەوتن لە وەختێکا کە لە مەنزیلەکەیا بووم لە مینا ئەو لای عومەری کوڕی خەطابا بوو - رضي الله تعــالی عنــه - لە ئاخــر حەجێکا کە عومەر - رضي الله تعالی عنه - کردی .. کـــە عەبدوڕەحمان گەڕایەوە لای من فەرمووی : خۆزگە چاوت لە پیاوێك ئەبوو کە ئیمـــڕۆ هاتە خزمەت ( أمير المؤمنين ) - رضــي الله تعالی عنه - عەرزی کرد : ( یــا أمير المؤمنين ) ئەزانی کە فلان کەس چی ئەڵێ ؟ ئەڵێ : ئەگەر عومەر بمرێ بەیعەت بــە فلان کەس ئەکەم [ زوبەیر فەرمووی : ئەگەر عومەر بـــمرێ بەیعەت بە عەلی ئەکەم - رضي الله تعالی عنهــم - قەســـطەلانی ] وەڵڵاهــی بەیعەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالی عنه - کوتوپڕ بوو بە تەدبیرو مەشۆرەت نەبوو ، لە پاشا تەواو بوو سەری گرت . عومەر - رضي الله تعالی عنــه - رقی هەڵسا فەرمووی : ( إن شاء الله ) ئەم ئێوارێیە لە ناو خەڵقا رائەوەستم ئەیانترسێنم لەو کەسانەی کە تەمایانە غەصبی وەظیفەی خەڵق بکەن بــە نــاحــەق . عەبدوڕەحمان - رضي الله تعالی عنه - ئەفەرموێ : عەرزم‌کرد : ئەی ئەمیرولمؤمینین وا مەکە چونکی مەوسیمی حەج رەعـاعو جاهێـلو خەڵقی نەفامو زۆری تیایە ، ئەوانەیشن کە زۆر لــە تــۆوە نزیك بــن لــەو وەختەدا کە لە ناو خەڵقا ئەوەستی ،ئەترسم تەشریفت رابوەستێو قســــە

(١) ئەگەر بیفەرموایە : دەرسم بە چەند پیاوێك ئەووت .. باشتر بوو .

بکەی : کە ئەو قسەیەت لە دەم بپچڕنەوە بیفڕێنن بۆ هەموو جێیێكو لـە مەقصوودت نەگەنو مەقصوودەکەت لە جێی خۆیا بەجێ نەهێنن • صەبر بکـە تـا ئەچیەوە مەدینە کە داری هیجرەتو سوننەتە ، ئەو وەختە خۆتو ئەهلی عیلمو تێگەییوو ئەشرافی خەڵق خۆبەخۆ ئەمێننەوە ، ئیتر سەربەست هەرچی ئەڵێی ئەتوانی بیڵێی ، ئەهلی عیلم مەقالەکەت حیفظ ئەکەنو لەجێی خۆیا ئیستیعمالی ئەکەن • عومەر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ فـەرمووی : وەڵلاهی کە گەییمەوە مەدینە ئەوەڵ مەقامێ کە لێی بوەستم لە مەدینـەدا ئـەوە ئـەڵێـم •

ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : دوای ( ذي الحجة ) هاتینەوە مەدینە کە رۆژی جومعە ئەبوو [ لەبەر ئەو فەرموودەی عومـــەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] عەجەلەمان کرد کە زوو بچینە مزگەوت ، لە وەختی زەوالی شیددەتی گەرمادا کە چووم سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلم دی لای گۆشەی مینبەرەکەدا دانیشتبوو [ـ رضي الله تعالى عنه ـ خۆی لە عەشەرەی موبەششەرەیە، زەیدی باوکی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیختیلاف لە پێغەمەرییتیا هەیە ، پێغەمەری دیوە ـ صلى الله تعـالى عليه وسلم ـ ( ومر فضلهما في الفضائل )[1]] لایەوەدانیشتم ئەژنۆم بـە ئەژنۆیەوە بوو ، ئەوەندە نەوەستام عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هاتەدەرێ [ لە جێی خۆی هەڵسا هات بۆ مینبەرەکە ] کە چاوم پێکەوت کە تەشریفی رووی کردە مینبەرەکە بە سەعیدم وت : ئێستە قسەیێك ئەفەرموێ کە لەمەوپێش قەت نەیفەرمووبێ • سەعید ـ رضي الله تـعالى عنـه ـ پێی باوەڕنەکردم فەرمووی : ظەن نابەم کە شتێك بفەرموێ کە قەت نەیفەرمووبێ• عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە تەشریفی لـــەســــەر مینبەر دانیشتبوو

(1) بڕوانە : لاپەڕە ٤٦٤ ی بەرگی سێیەمی ئەم کتێبە •

بانگدەرەکان بێدەنگ بوون تەشریفی هەڵسا ، بەوەی کە لایەق بێ بە خوا ئەنای خوای کرد • لە پاشا فەرمووی : ( أما بعد ) دوای حەمدو ئەنـا من قسەیێکتان پێ ئەڵێم کەوام بۆ موقەددەر کراوە کە پێتان بڵێم ، نایشزانـم بەڵکی ئەجەلم لێ نزیك بوو بێتەوە ، کە ئەو قسەیەتان بۆ ئەکەم ،هەرکەسێ تێی بگاو حیفظی بکا بۆ هەر جێیێ کە وشترەکەیی ئەگاتێو ئەیچێتێ نەقلی بکاو تەبلیغی خەڵقی بکا ، ئەوی کە ئەترسێ لەوە کە تێی نەگاو حیفظی نەکا حەلاڵ ناکەم بۆ هیچ کەس کە درۆم بەدەمەوە بکا :

خوای تەعالا بە حەق محمد ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـی ناردوە ، قورئانی بۆ نازڵکردوە ، لەوەی کە خوا نازلێ کردوە ئایـــەتی رەجـمە ، ئایەتی رەجممان خوێندوە تێیگەییوین حیفظمان کردوە ، چونکی خوا ئەو ئایەتەی نازڵکردوە • پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ رەجمی [زانیی موحصەنی ] کردوە ، ئێمەیش لە دوای ئەو رەجممان کردوە ، ئەتـرسـم ئەگەر خەڵق زەمانیان لێ بەسەربچێ یەکێ بڵێ وەڵلاهی ئێمە لە کیتابوڵلادا ئایەتی رەجم نابینین ، بە واسیطەی تەرکی فەرزێکەوە [ کە رەجمە ] رێیان لێ ون بێ [ ئێســتە چ فەرزێ هەیـە کـە تەرکمان نەکردبێ ؟ سا خـوا هیدایەتمان بدا ] رەجم لە کیتابوڵلادایە حەقە لەسەر کەسێ کە موحصـەن بێ [ یەعنی ژنی لە ژێر نیکاحی صەحیحا وەطء کردبێ ] پیاو بێ یا ژن بێ لەسەر زیناکەی شاهید بێ ، یا زگپڕبوون بێ ، یا ئیقرار بێ • لە پاش ئەمە کە پێموتن پێتانئەڵێم : لەو قورئانەدا کـــە ئەیخوێنین ئـەوەیشمان ئەخوێند کە ئیعراض لە باوكو باپیری خۆتان مەنێن [ باوکتان بێو خۆتان بە ئەولادی غەیرەو نەسەبتان بگۆڕن ] ئەوە کوفرە بۆ ئێوە کە ئیعراض لە باوكو باپیری خۆتان بنێن [ ئەم دوو ئایەتە تیلاوەتی[1] نەســـخ بوەتەوەو

(١) راست وایە بگوترێ : تیلاوەتیان نەسخبوەتەوەو حوکمیان . . .

حوكمی باقی ماوە ] خەبەرتان لەوەیش بیێ كە پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - فەرموویەتی : بە مەدحی باطیل هەڵمەدەنو موبالەغە بكەن لە مەدحما چۆن موبالەغە كراوە لە مەدحی عیسادا [ علیه السلام • ئەڵێن كوڕی خوایە ] ئێوە بڵێن عەبدی خوایەو ڕەسوولی خوایە •

لە دوای ئەوە كە ئەمەم پێوتن ئەوەیشتان پێئەڵێم كە خەبەرم پێ گەییوەتەوە كە بەعزێ لە ئێوە ئەڵێن : ئەگەر عومەر بمرێ بەیعەت بە فلاَن كەس ئەكەم • هیچ پیاوێ بەوە مەغروور نەبێ بڵێ بەیعەت بە ئەبوبەكر - رضي الله تعالی عنه - بەیعەتێكی كوتوپڕی بوو ، بێ تەدبیرو مەشۆرەت بوو ، ئەمما تەواو بوو یەعنی ئیعتیراضی لێ نەگیرا ، خەبەرتان بێ ئەوە وایە ، ئەمما خوا لە شەڕی ئەوە موحافەظەی كردین [ چۆنی موحافەظە ناكا كە بە وەحیي ئیلاهي پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - خەبەری داوە ( كما مر عن عائشة - رضي الله تعالی عنها - في مرض مرضته في الطب والمرضی ح - ٨/٣٣٧ ) ][(١)] هیچ كەسێ نیە لە ئێوە كە وشترسواری بگاتێ وەك ئەبوبەكر وابێ [ وەڵلاهی وایە گەورەی هەموو ئومەتە ] هەركەسێ بێ مەشۆرەتی موسوڵمانان بەیعەت بە پیاوێ بكا نە ئەو كەسەو نە ئەوی ئەو بەیعەتی پێ كردوە بەیعەتی پێ ئەكرێ [ تەبەعییەتی ئەكرێ • كما في أخری ] مەبادا بكوژرێن ؛ چونكی بێ پرسی موسوڵمانان كردوویانە خەڵقیان لێهەڵەگەڕێتەوەو ئەیانكوژن •

هەم ئەوەیشتان پێ ئەڵێم : حاڵی ئێمە لەو وەختەدا كە پێغەمەر -صلی الله تعالی علیه وسلم - وەفاتی كرد =وابوو= ئەنصار موخالەفەیان كردین ، هەموویان لە ژێر ساباطی بەنی ساعیدەدا كۆبوونەوە ، عەلیو زوبەیرو ئەتباعیان جوێ‌بوونەوە لە ئێمەو موخالەفەیانكردین • موهاجیرین لە

(١) بڕوانە ل : ٢٣٥ی بەرگی حەوتەمی ئەم كتێبە •

ئـــەبوبـــەكـــر كۆبوونـــەوە بـــە ئـــەبـوبەكـــرم وت : ئـــەی ئەبوبەبەكر با بچینە لای برادەرانی ئەنصاریمان ، لێماندا رۆیین بۆ لایـان [ تووشـی ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاح بووین • ئەبوبەكر - رضـي الله تعالى عنه ـ دەستی گرت لە بەینی منو ئەوا ئەڕۆیی • أخرى ] كـە لێیـان نزیكبووینەوە دوو پیاوی صاڵحمان پێگەیی [ عوەیمی كوڕی سـاعیدەو مەعنی كوڕی عەدیی ئەنصاریی ] بەیانی ئەوەیان كرد كە ئەنصار لە سـەر یەكێ ئیتتیفاقیان كردوە [ تەمایانە بەیعەت بە سەعدی كوڕی عوبادە بكەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] پرسییان : بۆ كوێ ئەچن ؟ وتمان : ئەچینە لای برادەرانی ئەنصاریمان • وتیان ، دەخڵتان چیە بە سـەریانەوە ؟ نزیـكیان مەكەون ئیشی خۆتان بكەن • من وتم : وەڵڵاهی ئەچینەلایان • رۆیین تـا چووینە لایان ، لە هەیوانی بەنیساعیدەدا ، تێفكرین پیاوێ لە بەینیانا بـە جلێ داپۆشرابوو ، پرسیم : ئەوە كێیە ؟ وتیان : سەعدی كوڕی عوبادەیە، وتم : چییەتی ؟ وتیان : لەرزو تایەتی • كە نەختێ دانیشتین خەطیبیان [ كە ثابیتی كوڕی قەیسی كوڕی شەماسە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ( من الـذين شهد النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بأنه من أهل الجنـــة • مـر فـي الايمان )[1] ] كەلیمەی شەهادەتی هێنا ، بەوەی كە لایەق بێ بە خوا ئەنای خوای كرد • لە پاشا وتی : ( أما بعد ) ئێمـە نـاصیری دینـی خـوایـن ، لەشكری دینی ئیسلامین ( صدق ) • ئەی مەعشـەری موهاجیرین ئێـوە قەومێكی كـەمن [ بە نیسـبەت ئێمەوە ] لە قەومی ئێوە میقدارێكی كـەم هاتە لای ئێمە [ لەبەر فەقرو ضەروورەت ] كەچی ئێستە وایان ئەوێ كـە لە ریشە دەرمانهێنن ، لە ئیمارەت مەحروومان بكەن •

(١) بڕوانە : ل : ( ٤٤٩ )ی بەرگی یەكەمی ئەم كتێبە .

[ عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ] کە ثابیت بێدەنگ بوو تەمام وابوو قسە بکەم ، لە پێشا قسەیێکم ڕێكخستبوو لام وابوو کـە قسەیێکی باش‌و عەجائیبە ، ئیرادەم بوو لە بەردەمی ئەبوبەکر ـ رضي الله عنه ـدا بیلێم مودافەعەی ئەوەم ئەکرد ، کە بەعزێ حیددەتی لێ قەطع بکەم [ یەعنی مەبادا بە خوطبەکەی ثابیت حیددەت بکاو شتێك بفەرموێ کە ببێ بە سەبەبی ئیختیلاف ] کە تەمام بوو دەست بکەم بە قسەکردن فەرمووی : تۆ جارێ ڕاوەستە ، حەزم‌نەکرد کە ڕقی هەڵسێنم [ بە ئەمرم کرد ] ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەستی کرد بە قسەفەرموون ، ئەو لە من بە حیلمتر بوو بە تەئەنی‌تر بوو ، وەڵڵاهی کەلیمەیێکی لەوە کە من تەرتیبم کردبوو و بە عەجایەبم ئەزانی تەرك نەکرد ، بێ ئەمە کە تەفەککوری لێ بکاتەوە ، یا وەك ئەوە یا باشتری فەرموو تا بێدەنگ بوو لە فەرموودەکەیا فەرمووی: ئەو خێرەی کە ذیکرتان کردو لە ئێوەدایە [ وەڵڵاهی ئەی مەجلیسی ئەنصار ئێمە فەضلی ئێوەو موبتەلابووتتان لە خوصووصی ئیســــلامەوە ئینـکار ناکەین ، حەقتان بە سەرمانەوە هەیە ئینکاری ناکەین ] ئێوە ئەهلن بۆ ئەو خێرو فەضیلەتە ، ئەم ئیشی خەلافەتە بۆ غەیری ئەم قەومە کە قورەیشـن نابێ ، قوریش ئەعدەل‌و ئەفضەلی عەرەبن لە نەسەباو لە وەطەنا ، بۆ ئێـوە وام بە موناسب زانیوە کە یەکێ لەم دوانە ئیختیار بکەن بەیعەتی پێ بکەن، هەرکامێکتان لەم دوانە هەوەس پێنێ دەستی من‌و دەستی ئەبوعوبەیـدەی کوڕی جەڕاحی گرت ئەو =واتە ئەبوبەکر = لە بەینمانا دانیشتبوو ، لـە قسەی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەوەم لە لا ناخۆشتر نەبـوو کــە فەرمووی : بەیعەت بکەن بە یەکێ لە عومەرو ئـــەبوعوبەیدە ، وەڵڵاهـی بمبەنەپێشەوە کە لە گەردنم بدرێ ، ئەو لەگەردن‌دانەم ، بەو شەرتە کە لە گوناه نزیکم نەخاتەوە ، لام خۆشترە لەوەی کە ببم بە ئەمیر لەسەر قەومێ

کە ئەبوبەکری تیابێ ـ رضي الله تعالی عنه ـ ( اللهم ) مەگەر نەفسم ئـەو ئەمیرییەم لە لا بڕازێنێتەوەو پێم بکا لە وەختی مردنا کە ئێستە ئەو ئارەزووەم نیـــــه •

یەکێ لە ئەنصار [ حوبابی کوڕی مونذیر ـ رضي الله تعالی عنه ـ ] وتی : ئێمە بۆ خـــەلافەت وەك ئەو دارە واینە کـــە بۆ وشتری گـەڕی دائەچەقێنن کە خۆی پێبخورێنێ ، یا وەك ئەو هێشوە خورمایەین کە بەری ئەوەندە زۆرە کۆڵەکەی ئەدەنەبەر کە نەکەوێ [ یەعنی بە قووەتو شەوکەت موحافەظەی خەلافەت ئەکەین لە ضەعیفیو بە قووەتی ئەکەینو ئەیهێنینـە بەر ] لە ئێمە ئەمیرێكو لـە ئێوە ئەمیرێك ئـــەی جەماعەتی قـورەیش • غەڵبەغەڵبە زۆر بوو دەنگ بەرز بۆوە ئەوەندە لە ئیختیلاف ترسام ، وتم: دەست بێنە یا ئەبوبەکر ، دەستی هێناو بەیعەتم پێکـرد • موهاجیرینیش بەیعەتیان پێکرد ، لە پاشا ئەنصاریش بەیعەتیان پێکرد ، هەنگاومان بەسەر سەعدی کوڕی عوبادەدا هەڵێنا ، یەکێك لە ئەنصار وتی : سەعدی کوڕی عوبادەتان کوشت ، وتم : خوا بیکوژێ •

[ سەعد ـ رضي الله تعالی عنه ـ چوو بۆ شام لە غوسڵخانەدا بە مردوویی بینییان ، بەدەنی شین بووبووەوە ، کەس خـەبەری لـە مردنی نـەبوو تـا دەنگی یەکێکیان بیست ، دەنگی بوو رەنگی نەبوو ، ئەیوت :

قـد قتلنـا سـيد الخـزرج ســـعد بـن عبـــاده
فــرمينـــاه بســــــــهمين فـلم تـخط فـــؤاده

سەییدی خەزرەجمان کوشت کە سەعدی کـوڕی عـوبادەیە ، دوو تیرمان تێگرت بە خەطا نەچوو لە دڵی دا • قەسطەلاني ] •

عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووى : ئێمە وەڵلاهى لەوەدا کـە حازرى بووين هيچمان لەوە لە لا بە قووەتتر نەبوو کە موبايەعە بکەين بە ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەوە ترساين ئەگەر لە ئەنصار جوێ بينەوەو بەيعەت نەکرێ ئەنصار لە دواى ئێمە بەيعەت بکەن بە پياوێ لە خۆيان ، يا ئێمەيش بەنارەزايى بەيعەتى پێ ئەکەين ، يا موخالەفەيان ئـەکـەين‌و ئـەو وەختە فەساد ئـــەبوو • کە وابێ هەرکـەسێ بـە بێ موشـاوەرە لـەگـەڵ موسوڵمانان بەيعەت بکا بە يەکێ تەبەعييەتى ناکرێ نە هى ئەو نە هى ئەوەى کە ئەو بەيعەتى پێ‌کردوە ، مەبادا ئەو دوانە بکوژرێن • [ يەعنى خەڵق بەو بەيعەتە رازيى نەبن‌و هەردوکيان بکوژن ] ح ـ ١٨/١٠ إلى ٢٤ •

[ نەسائيى ريوايەت‌ئەکا لە زيرى کورى حوبەيشەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە سەنەدێکى حەسەن کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووى : ئەى جەماعەتى ئەنصار بۆ ئێوە نازانن کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ ئەمرى کرد کە ئەبوبەکر نوێژ بە خەڵق بکا ؟ کامتان پێى‌خۆشە کە لە ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێش بکەوێ ؟ فەرموويان : ( نعوذ بالله ) کە لێى پێش‌بکەوين • قەسطەلانى ] •

٣٨/٣٩٦٥ ـ مســـور بن مخرمـة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أخبر أن الرهط الذين ولاهم عمر [ رضي الله تعالى عنه ] اجتمعوا فتشاوروا قال لهم عبدالرحمن ••• إلى آخر الحديث ح ـ ٢٥٣/١٠ •

## تەرجەمە :

ميسوەرى کورى مەخرومە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەو قەومەى کە حەزرەتى عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووبووى يـەکـێ لەوانە ئينتيخاب بکەن [ کە حەزرەتى عەلى‌و عوثمان‌و زوبـەيرو طـەلحـەو

سەعدو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفن ـ رضي الله تعالى عنهم أجمعين ـ ] کۆبوونەوە مەشۆرەتیان کرد ، عەبدوڕەحمان ـ رضـي الله تـعالى عنـه ـ پێیفەرموون : من لەوانە نیم کە لەمەدا مونازەعەتان لەگەڵ بکەم [ یەعنـی بە تەمای خەلافەت بم ] لەم ئەمری خەلافەتەدا ، ئەمما ئەگەر ئێوە ئارەزووتان بێنێ لە ئێوە یەکێکتان بۆ ئینتیخاب ئەکەم ، ئەوانیش ئەو ئیشەیان تەودیع بە عەبدوڕەحمان کرد کە ئیشەکەیان بەو سپارد ، خەڵق هەموو مەیلیانکرد بە لای ئەوەوەو دووی کەوتن ، هیچ کەسم نەدی لە خەڵق کە شوێن یەکێ لەوانی تر بکەوێ پێ بە شوێن پێی یەکێکیانا بنێ • خەڵق لە عەبدوڕەحمان کۆبوونەوەو موشاوەرەیان لەگەڵ ئەکرد ، لەو شەوانەدا [ عەبدوڕەحمـان لەگەڵ هەرکامێکیانا خەڵوەتی ئەکرد هیچ کەسێ لەوانی تر ئاوتای ئیمامی عوثمانی نەئـــەگرت ] تا ئەو شەوەی کــە بۆ سبەینێ بـــەیعەتیـان بـــە عوثمـان کــرد •

میسوەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : شـــەو عـەبدوڕەحمان هاتەلام نوستبووم خەوم لێکەوتبوو ، لە دەرگاکەی دا تا خـەبەرم بـۆوە فەرمووی : وا بزانم کە نوستبووی ، وەڵڵاهی ئیمشەو [ ئەم سێ شەوە • کەشمیهەنی ] ئەوەندە خەو نەچوەتە چاوم ، بچۆ زوبەیرو سەعدم بۆ بانگ کە ، چووم بۆم بانگکردن(١) موشاوەرەی لەگەڵکردن ، لە پاشا بانگیکردم فەرمووی : بچۆ عەلیم بۆ بانگ کە بۆم بانگکرد ، قسەی لەگەڵ کرد تا وەختی نیوەڕۆ [ لە ریوایەتی سەعیدی کوڕی عامیرا ئـەفـەرموێ : کـــە میسوەر ئەیفەرموو : بەعزێ وەقت دەنگیان بەرزەبۆوە هیچم لێ مـەخفی نەئەبوو ، بەعزێ وەقت دەنگیان پەست ئەکردەوە ] لە پاشا عەلی ـ رضي الله

(١) راستوایە بفەرموێ : چووم بانگمکردن بۆی •

تعالی عنه ـ هەڵسا بە تەما بوو کە خەلافەتی تەودیع بـکا ، عـەبدوڕەحمان نەختێ لە عەلی ئەترسا [ کە ئەگەر بێتو عوثمان تەعیین بکا عەلی موخالەفـە بکاو فیتنە بەرپابێ ] لە پاشا پێی فەرمووم : بچۆ عوثمانم بۆ بانگ کـە . بۆم بانگ کرد لەگەڵ ئەویشا قسەی سیرڕیی کرد تا بانگی موئەذذین بـۆ صوبح لێکی جویْ کردنەوەکە نۆیژی سبەینێی کرد بۆ خەڵق ئـەو پێنـج کەسە لای مینبەرکۆبوونەوە ، عەبدوڕەحمان ناردی بە شوێن ئەو موهاجیرو ئەنصارەدا کە حازربوون ، ناردی بە شوێن ئومەرای لەشکرا [ کە موعاویەی ئەمیری شامو ، عومەیری کوڕی سەعد کە ئەمیری حیمص بوو ، موغیرەی کوڕی شوعبە کە ئەمیری کووفە بوو ، ئەبوموسای ئـەشـعەریی : کـە ئەمیری بەصرە بو ، عەمری کوڕی عاص کە ئەمیری میصر بوو ، تا هەموو ئەهلی حەلل و عەقدی کۆکردەوە ] ئەوانە ئەو ساڵە هاتبوون بۆ حەجکردن لەگەڵ عومەرا ـ رضي الله تعالی عنه ـ [ لە خزمەتیا هاتبوون بۆ مەدینـە ] کە کۆبوونەوە عەبدوڕەحمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ کەلیمەی شەهادەتی هێنا ، لە پاشا فەرمووی : ( أما بعد ) دوای حەمدو ثەنا ئەی عەلی تەماشای فیکرو رەئیی خەڵقم کرد هیچیانم نەدی کە کەسێ بە هاوتای عوثمان بگرن ، هیچت نەیێ بە دڵا کە عوثمان ئینتیخاب بکەم ، بە عوثمانی وت : بەیعەتت پێ ئەکەم لەسەر سوننەتی پێغەمەری خوا ـ صلی الله تعالی علیه وسلـم ـو دوو خەلیفەی دوای ئەو ـ رضي الله تعالی عنهما ـ عەبدوڕەحمان بەیعەتـی پێ کردو موهاجیرو ئەنصارو رۆئەسای ئەجنادو موســوڵمانان هـەمـوو بەیعەتیان پێ کرد ـ رضي الله تعالی عمن صلح منهم ـ .

تـم بحمد الله
وهدايته وحسن توفيقه
مـا أردت أن أجمعـــه مـن
أحاديث الشيخين مسـلم والبخاري
ـ رحمهما الله تعـالى ـ مـع ســائر
المحدثين فحصـــل منهما ـ ما عـدا المكرر ـ
ثلاثـة آلاف وتسعمائة وخمس وسـتون = حديثاً =
جعله الله ذخرة لعقبانا ، وعفـا عمـا رأينا بحسب النفس
الأمارة ، ونفع الله بـه المسلمين آمين . ســنة ألف وتســعمائة
واثنتين وأربعين من الســنة الميلاديـة في اليـوم الثلاثين مـن
كـانون الثـاني في ضـــحوة يـوم الجمعـة ١٢ من
شـــهر محـرم الحـرام من سـنة ألف وثلاثمائـة
وإحــدى وســتين من هجــرة ســيد
المرســلين ـ عليــه صــلوات الله
رب العـــالمين وعلـى آلـــه
واصـــحابـه وذريـــاتـــه
وازواجـــه الطيبيـن
الطاهريـن(١)

● رشـيد بـابـان

(١) دواى راســـتكردنەوەى يـەك دوو هەڵەى بچووكى دانەر ـ خ ـ وا تەرجەمەى ئەم وتەى دەنووسين :

سوپاس بۆ خوا بە هۆى يارمەتى خوداو هيدايەتى جوانو تەوفيقى ئەوەوە ئەوەى كە ويستم لە حەديثەكانى دوو شـــێخەكە : بوخاريىو موسليم كۆى بكەمەوە تەواو بوو ، لە هەردوكيان ـ دووپاتى لێ دەرچێ ـ سێ هەزارو نۆصەدو شەصتو پێنج حەديث پێكهات . خوا بيكات بە توێشووى پاشەڕۆژمو لە رووپامايشم كە بـە گوێرەى نەفسى بـەد كردبێتم خۆش بێو ، سوودى پێ‌بگەيێنێ بـە موسوڵمانان ، ئامين . ئەمەيش لە رۆژى ٣٠ كانوونى دوەمى ســالى ١٩٤٢و رێكەوتى رۆژى جومعەى ١٢ى مانگى موحەرەمولحەرامى ساڵى ١٣٦١ى كۆچى گەورەى پێغەمەران بوو ـ درووودى خوا لەســەر خۆىو يارانو نەوەو خێزانـە پاكو تەميزەكانى بێ ـ رەشيد بابان .

# وەصـــیەت نامــــــە

وصيتي إلى ملا حسـين وابنه السلام سەلامی خوایان لەسەر بێ[1].

بیستو دوو مانگی تەواوە دەستم‌کردوە بە تەرجــــەمەی موسـلیمو بوخاریی وا ئەمساڵ لە دوانزەی ( محرم الحرام )ا ( بحمد الله ) تەواوبوو . هەرچەندە هەردوو کتێبەکە لەسەر ئەبوابی فیقھ تەرتیب‌کراون مەسلەکیان لـە یەك جوێیە ، هەر یەك لە مەسلەکی خۆیا نەظەرێکی مەعقوولی هەیـە . موسـلیم - رحمه الله تعالى - لە کوللی بابێکا ئەو حەدیثانەی کە ریوایـەتی کردوە طوروقی سەنەدەکانی هـەموو کۆکردوەتەوە ئـەمجا حـەدیثەکـەی ذیکرکردوە . کوللی حەدیثێکی لە بابی خۆیا ذیـکر کـردوە ، کـەم وا واقیع ئەبێ کە حەدیثێکی لە دوو بابا ذیکر کردبێ .

بوخاریی - رحمه الله تعالى - حەدیثێکی بە موناســـەبە لە ئـەبوابـی موتەفەڕڕیقەدا ذیکر کردوە ، لە هەر جێێێکا بە طەریقێکی غەیری طەریقی پێشوو ئەو حەدیثەی ، یا بە تەواویی ، یا پارچەیێ بە موسـنەدیی یـا بـە موعەللەقی ئیعادە کردۆتەوە . تەرجەمەیێکی موناسب بەو بابەی بۆ داناوە، وا ئەبێ بەو نەوعە تەنها حەدیثێکی لە دوو ، یا سێ ( إلى ) بیست جێگەدا ئیعادەکردۆتەوە . بە سەبەبی ئەوەوە ئـەحادیثی بوخـاریی ، کـە ئـەمجا دووهەزارو حەوصەد ببێ یا نەبێ ، گەییوە بە نزیکی شـەش[2] هـەزار . ئەحادیثی موسلیم گەییوە بـە نزیکی پێنج‌هەزار . تا پێم‌کرابێ وەك موسلیم

---

(1) ئەم وەصیەت نامە لە سەرەتای بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا بلاوکرایەوەو لەوێ بەڵێنمان دا کە لە جێگەی خۆیشیدا بلاوی بکەینەوە ، ئەوە خودا یارمەتی داین‌و بەڵێنەکە هاتەجێ .

(2) لە پێشـەکی شەرحی ( مسلم )دا دەفەرموێ : بوخاری لەگەڵ دووپاتەکانیا ( ٧٢٧٥ ) حەوت هەزارو دووصەدو حەفتاو پێنج حەدیثە .

ئەحادیثی بابێکم ، با موناسەبەی بە گەلێ باب بێ ، هەر لە یەکێ لەو بابانەدا نووسیوە ئیسنادەکانیشم ، مەجبوورییەت حاصڵ نەبووبێ ، هەمووم طەیکردوە ، تەنها صەحابیی حەدیثەکەم نووسیوە • ئەو پیاوانە ـرحمهم الله تعالىـ تا بە عیلمی دەقیقی موسلیمو بوخارییو مەشایخی ئەوان، تا گەورەو بچووکیان بە تەواوەتی تەحقیقی وثووقو حیفظو دیانەتیان نەکرابێ ، کە ئەو تەحقیقاتە بۆ ئەهلی ئەم زەمانە لە ئیمکان خاریجە •• نەقلی حەدیثیان لێ نەکردوە • ئێمە ئەوانە هیچیان ناناسین ، ئیعتیمادی موسلیمو بوخاریی بەوان بۆ دوای خۆیان کافییە ، بۆ ئێمە هەر ئەوەندە لازمە کە بزانین حەدیثی موسلیمو بوخارییە ، لە سەر عیلمو فەضلو وثووقو قووەتی حیفظی ئەو دو ( نیر )ی ئەعظەمە ئیجماعی هەموو ئەهلی سوننەتو جەماعەت هەیە ، ئەو دوو کتێبە لە دوای قورئانی جەلیل ئەصەححی کوتوبی ئیسلامیەیە ( أحسن الله جزاءهما مع سائر المحدثين والمجتهدين والعلماء الناقلين ) •

بەم ئیختیصارە حەدیثی هەردوو کتێبەکە هاتۆتە سەر سێ هەزارو نۆصەدو شەصتو پێنج حەدیث ، ئەگەر بە تەواوەتی تەنقیح بکرێ رەنگە گەلێ لەو میقدارەیش کەمتر بکا •

بە ئەمری مەلا حسەین ناوم ناوە ( اقتران النيرين في مجمع البحرين ) لە عومری حەفتاو دوو ساڵیما ئەم بارە قورسەم هەڵگرت ، لە حەفتاو چوار ساڵیما ( بتوفيق الله تعالى ) تەواوم کرد • لە کۆکردنەوەیاو نووسینیا لەبەر پیرییو دەستلەرزینو فوتووری عەقڵو ذیهنو شوعوور زۆر زەحمەتم تیا کێشاوە ، رەنگە لە تەرجەمەیشیا غەلەطو سەهوم زۆر بێ ، ئومێدم لە خزمەتتانا وایە کە غەڵەطێ یا سەهوێکتان بەچاوکرد زۆرم لە سەرو گوێلاك بدەن تا ئیصلاحی ئەکەن• مەیشێڵن بفەوتێو مەحو بێتەوە ، لە ئەهلی خۆی مەنعی مەکەن ، ئەمە شتێکە بۆ عەوامو نائاشنا بە عولوومی عەرەبییە کراوە،

عولەما ئیحتیاجییان پێی نیە • ئەوی عەرەبی ئەزانێ هەر مەتنی حەدیثەکەی بنووسێ ؛ چونکی جامیعی هەموو موسلیمو بوخارییـە ، حـەدیثێکیان لێ تەرك نەکراوە[1]، ئەوان لەبەر موختەصەرێتی ئیستیفادەی لێ ئـەکـەن • ئەوی عەرەبی نازانێ هەر کوردییەکەی بنووسێ ، فەقەط هەردوو لا هەردوو لای بنووسن ئەویش بێ فائیدە نابێ • ئیشارەتەکانم ، ئەگەر چـی لـە ئەوەڵەوە نووسیوە ، ( إحتیاطا ) لێرەیش ئەیان نووسم :

ئەوی لە کەنارەوە نووسیومە مەثەلا ( ٢٤٦/٢٥ ) هی سەر خەتـەکە حەدیثی ئەو بابەیە مەثەلا ( إیمان ، صلاة ، صوم ••• إلخ ) ئەوی لە ژێر خەتەکەدا نووسراوە عەدەدی حەدیثی ( اقتران النیرین )ە لە ئەوەڵەوە تا ئەو جێیە ، ئەوی لە ئاخری کوللی حەدیثێ نووسراوە مەثەلا خ – ٢٥/١ • خ بوخاریی ، (١) جەلدی ئەوەڵ ، (٢٥) صەحیفەی ئەوجەڵدە ( وعلیە فقس° )•

م – ٥٥/٢ • م موســـلیم ، ٢ جەڵدی دوەم ، ٥٥ صــەحیفەی ئـەو جـەڵــدە •

ت : تـرمذیی •

ن : نەسائیی • — ئەمانەم موافیقی قەسطەلاني نووسیوە •

د : ئەبوداود •

جە : ئیبنوماجەھ •

ئەوەندە کافیە ( والسلام علیکم وادعوا لي بالخیر )

رەشـــــید •

٥ رەبیعی دوەمی ١٤١٠ ك

١٩٨٩/١١/٤ز — م – ع • ق •

(١) ماموستا بە گوێرەی ئاگاداریی خۆیو ئەوەی بە تەمـا بوە وابێ ئەمەی نـووســـــیوە ، بەڵام وەك روونی دەکەینـەوە کـەوتنو لەبیرچوونی هەیـە •

# پاشـــکۆیەکی پێویست

**- ١ -**

لە کاتێکدا کە قوتابی پۆلی دووەمی کۆلیجی ئیمامی ئەعظـەم بـووم‌و سەرگەرمی خوێندن بووم‌و « ئاگام لە مەحمووی بێ‌زەواڵ نەبوو » رۆژێك مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس - خودا تەمەنی پیرۆزی لەگـەڵ لەش‌ســاغیدا درێژبکات - ناردی بەشوێنما ، کە چوومە خزمەتی دەبینـم حاجی عەبدولقادری جەببـــار - گۆڕەکەی پڕ نوور بێ - لـــە خـزمەتیـا دانیشتبوو دەفتەرێکی بە دەستەوە بوو • دوای چاك‌و چۆنی‌و حەسانەوە مامۆستا فەرمووی : جەنابی حاجی عەبدولقــادر دەیەوێ کتێبەکەی مــەلا رەشید چاپ بکات‌و ، ئەمانەوێ تۆ بینووسیتەوەو ســـەرپەرشتی چـاپی بکـــەیـــت •

منێك کە تــا ئەو کاتە جگە لـــە نووسینی نامـــە بۆ ئـــەم‌و ئـەوو وەڵامدانەوەی نامەیان‌و ،جگە لە نووسینەوەی یەك دوو کتێبی مامۆســتا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ؛ وەك دووڕشتەو ، بەهارو گوڵزار -ئەویش بۆ خۆم - شتێکی کوردیم نەنووسیوەتەوە بەخەیاڵیشما نەهاتوە کە دەست بۆ کاری وەها بەرم ••وەك لە سەربانێك بمخەنە خوارەوە وەها بوو ! بۆیە بــە سڵەمینەوەو سەرسوڕمانێکی ئاشکراوە بە (نا) وەڵامم دانەوە • بەڵام مامۆستا فەرمووی : من وا بە باش ئەزانم ئــەم خزمەتە بکەیت‌و خودایش یارمەتیت ئەدات • بەڵێ درێژەی نەدەمێ قسەی مامۆستامم بۆ نەشکاو ،

وەك بڵێن کێوی (سپێیین) هەڵەگرم ئەوەندەم لەبەر شان گران بوو ؛ چونکە وەك گوتم لە لایەکەوە قوتابی کۆلیجی ئیمامی ئەعظەم بووم و ، سەرقاڵی مزگەوت و ، ماڵ و خوێندنبووم و ، لەو لایشەوە قاڵبووی مەیدانەکە نەبووم و کارامەی کارکردنی ئەو بوارە نەبووم و ، کارەکەیش کارێکی بچووك و چەند پەڕەیەك ، یان نامیلکەیەك نەبوو ، بەڵکو گەورەترین کتێبی کوردی بوو بە بەشی سەرەتای نووسینم ! هەرچۆن بێت دەفتەرەکەم وەرگرت و ناوی خوام لێ هێنا •

وەختێ دەستم دایە کارو هاتمە سەر نووسینەوە دەبینم ئەو زمانەی کتێبەکەی پێ نووسراوە لەگەڵ زمانی نووسینی ئەم سەردەمەدا زۆریان بەینەو گۆڕانێکی زۆر لە زمانی نووسینی ئەمڕۆدا رووی داوەو ، وەك دەڵێن : هەر خوایان یەکێکە • بۆیە خۆم لە نێوان دوو باردا دییەوە : یان کتێبەکە خۆی چۆنە منیش وای بنووسمەوەو هیچ دەسکاریی لایەنی زمانی نەکەم • یان دەسکاریی شێوەی نووسین و زمانەکەی بکەم و بیخەمە سەر شێوەی نووسینی ئەم سەردەمە • دوای هاوردوبردو بیرکردنەوەیەکی زۆر خودا خستیە دڵمەوە کە ئەگەر دەسکاریی زمانەکەی بکەم کارەکەی مامۆستا مەلا رەشید دەشێوێنم و لە کتێبی ئەو دەکەوێت و ، وای لێ دێ ئەگەر خۆی زیندوبێتیەوەو بیبینێ نەیناسێتەوە • ئەمەیش پێچەوانەی ئەمانەت و رێبازی بووژاندنەوەو زیندوکردنەوەی بەرهەمی کۆن و کەلەپوورو زمانە • لەبەر ئەمە بڕیارم هاتە سەر ئەوە کە هیچ دەسکاریی شێوەو زمانی نووسینەکەی مامۆستا نەکەم •

ـ ٢ ـ

ئێستە لە دوای ( ١٦ ) ساڵ لە ژیانێکی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی و ، کسپەو ئازارو ، بوونی و نەبوونی و ، چەشتنی دەیان و سەدان تاڵی و

ناخۆشی‌و ٠٠٠له هەموویشیان ناخۆشتر بۆلاچوون‌و داواکردن له چەندین مەردو نامەرد ـ بۆ خۆم‌و ماڵ‌و منداڵم نا ـ بۆ چاپ‌و بڵاوکردنەوەی ئــەم کتێبه ٠٠ خۆم زۆر به بەختەوەر دەزانم که ـ بـه ئازایەتی خۆم نا ـ خودا یارمەتی دام‌و گەیشتمه دوا لاپەڕەو دێری نووسینەوەی ئەم کتێبه پیرۆزە٠

بەڵێ لەم ماوەی تەمەنمدا سەرو مڕ خەریکی ئەم کتێبه نەبووم‌و خودا یارمەتی داوم هەر لەم ماوەدا تەفسیری نامی‌و ، ( مواهب الـرحمـان ) و ( علماؤنا في خدمة العلم والديـن )و بنەماڵەی زانیارانی مامۆسـتا مـەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسم پێشکەشی خوێندەواران کردو ، تا ئەندازێکی باشیش تیایانا سەرکەوتم ، هەروەها لەم ماوەدا چەند دیوانی شاعیرو کتێب‌و نامیلکەم بۆ خۆم ئەنجام‌داو ئەوانیش لەگەڵ دەیان وتاری گەورەو بچووکدا پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کران ٠ بەڵام ئەمانه هیچیان لەبەر ئــەوە نەبوە که لەم پرۆژه سارد بم‌و خۆمی لێ بدزمەوە ، بەڵکو هەمیشه نەبوونی‌و بێ‌پارەیی‌و کەم‌دەرامەتیی لەچاپدان وایان کردوه که ماوەیەك دەستم لــەم هەڵگرتبێت‌و به شتێکی دیــکەوە خەریك بوویێتم ؛ چونــکه هەمیشــه چاوەڕوانی هەلی لەچاپدانی بەرگ‌و بەشێکی تری ئــەم کتێبـه بـووم‌و ، هەمیشەیش خۆشترین کاتی ئەم ماوەی ژیانم ئەو کاته بوە کــه دەرفەتم دەست‌کەوتبێت‌و گەڕابمەوە لای ئەم دەریا بـەرین‌و بێ‌پەیـەو ، له ژێــر سێبەری فەرمایشته پیرۆزەکانی پێغەمەردا ـ د ـ فێنکیی بۆ لەشی شەکەت‌و ماندووم هاتبێت‌و ، به سروەی بێدارکەرەوەی هەست‌و دەروونی ئــــەم وتاره جوانانه ئارەقی ماندوێتی ڕێگەی ژیانی پـڕ گرفت‌و دەردی‌سـەریم وشك بوویێتەوە ؛ چونکه ئەم فەرمایشتانه شتێك نین که مرۆڤ چـەشـی کردن‌و چێژی لێ‌وەرگرتن‌و خۆشییان گەییه ناخی دەروونی ئیتر تێریـان

لێ بخواو ،لە دانیشتن لە سێبەریانا وەڕس ببێو ، سێبەری وتارو پیرو باوەڕێکی تری بەلاوە لەم پەسەندتر بێت •

وەك نازو نیعمەتی خودا بەسەرمەوە ئەوەم لە بیر ناچێت کە ئەم ماوە دوورو درێژەی خەریکبوونم لەگەڵ ئەم کتێبەدا چەند جار بارو دۆخی ژیانی خۆموماڵو منداڵم وای لێ هاتوە لەوانە بوە کە منیشو کتێبەکەیش تێدابچین ، بەڵام خودا هەردوکمانی پاراستوە •

هەروەها لەم ماوەدا زۆر لە هاوەڵانمو لەوانەیش لە خوێندەواریدا لە من کەمتر بوون هەوڵی شەهادەی باڵایان داو بە دەستیان هێنا ، بەڵام من خەریکبوونم بەم کتێبەوە خستە باڵای هەموو شەهادەیەکی باڵاوە •

جێگەی ئەوەیشە کە لێرەدا وەڵامی پرسیارێکی خوێنەران بدەمەوە کە گەلێ جار رووبەڕوو لە خۆم ، یان بە نامە ، یان بە تەلەفوون هەواڵی بەرگی دوەم دەپرسنو دەڵێن : چی بەسەرهاتو ؟ بۆ چاپ نەکرا ؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێم : پتر لە هەشت ساڵە بەرگی دوەم لە (بەیرووت)ەو بە هیواین لەوێ چاپ بکرێتو : بارو دۆخی ئەو وڵاتەیش لە کەس شاراوە نیە • لە پەنای ئەموەڵامەدا موژدەیەکی دیکەیش بە خوێنەران دەدەم ؛ لە هەموان ئاشکرایە کە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە پێش (١٦) ساڵ چاپکراوەو ئەو کاتەیش کە چاپ کرا دوای ماوەیەك حاجی عەبدولقادری جەبباری رەحمەتیی کتێبەکەی بەسەر مزگەوتەکانی کوردستاندا دابەشکردو ، ناوی وەقفی لێ نا • لەبەر ئەمە زۆر لە خوێنەرانو ئەوانەی بەرگەکانی دیکەیان هەیە بەرگی یەکەمیان نیەو بۆی دەگەڕێن ، لە بەر ئەمە ئێستە کە لە نووسینەوەی دوابەرگی بوومەتەوە بڕیارم داوە پشت بە خودا بگەڕێمەوە سەر بەرگی یەکەمو سەرلەنوێ پوخت بینووسمەوەو چاپی بکەمەوە ، داوای دۆعای تەوفیقو سەرکەوتنیش لە

ئێوەی خۆشەویست دەکەم چونکە بێ تەوفیقی خوا هیچ کەس هیچی بۆ نـاکـرێت •

وە هەر دوابەدوای بەرگی یەکەم ئەگەر تا ئەو کاتـە بەرگی دوەم سەری هەڵنەدا دەست دەکەم بـە بەرگی دوەمو ، ئـەو کەلەبەرەیش بـە یارمەتی خودا دەگرم •

**ـ ٣ ـ**

لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا داوام لـە خـــوێنەران کـرد هەرکەس هەرچی بە بیردا دێتو هەر سەرنجێکی دەربارەی ئەم کتێبە هەیە بینووسێو رای‌بگەیێنێو یارمەتیسان بدات بۆ ئەوەی بـەرگەکانی تـری باشترو پوختتر بلاّوکرێنەوە • بەلاّم تا ئێستە کە (١٦) ساڵ زیاتر بەســەر ئەو نووسینەدا تێپەڕ دەبێت ، جگە لە وتارێکی مامۆستا جەمال بابان کـە لە سەرەتای بەرگی دوەمدا وەلاّمم داوەتـەوە ، شتێکی ئـەوتۆم نـە بـــە خوێندنەوە نە بە قسەو گوتار نەدیوەو نەبیستوە •

وا ئێستەیش کە قەڵەم لەسەر دوا وتەو دوا دێڕی ئەم کتێبە پیرۆزە هەڵدەگرم ، ناڵێم خۆم رەخنە لە هەموو کتێبەکەو کاری خۆم لە کتێبەکەدا دەگرم ، بەلاّم بە کورتیی بە هەندێ لایەندا دەچمەوە ، کە یان بەســـەرما تێپەڕیون ، یان بۆم نەلواوە لەوە باشتریان بکەم :

١ ـ ئەم کتێبە لە کاتێکدا نووسراوە نووسینی کوردیو بـەکـوردی نووسین لە گاگۆڵکێدا بوەو ، زمانی کوردی لە ژێر سێبەرو تەئثیری سێ زمانی سێ گەلی دراوسێو هاوئایینو باوەڕی گەلی کوردا بوەو ، ساڵەهای ساڵیش ئەو تەئثیرە بە ناخی وتارو زمانی ئەم گەلەدا چوەتە خوارەوە •

نووسەرێکیش کە بەو شێوە زمانی پڕابێتو ، هەموو تەمەنی خوێندنو ڕۆشنبیریی بەو شێوە بوو بێتو ، دوو کتێبی نووسراو بە زمانەکەی خۆیی نەخوێندبێتەوەو ، مامۆستایەکیش نەبووبێ پێی بڵێ چۆن بکاو چۆن بنووسێو ..هاتبێ یەکسەر دەستی دابێتە نووسینی کتێبێك کە تائێستەیش گەورەترین کتێبی کوردییە کە نووسرابێتو ، ئەو کتێبەیشی لە زمانێکی دیکەوە وەرگێڕابێتە سەر زمانی کوردیو ، زمانەلێوەرگیراوە-کەیش ئەو زمانە نەبێ کە ئێستە خەڵکەکەی پێیئەنووسنو ئەدوون ، بەڵکو زمانی پێش چوارده صەده بێت .. ئایا دەتوانێ هەموو هەڵو مەرجێکی زمانی تێدا بەدیبێنێو ، نووسینێکی کوردیی پاراوو سەرکەوتووی بێ قۆرتو گرێ بنووسێ ؟ یان دەتوانرێ داوای ئەوەی لێ بکرێت کە بەو شێوەی نووسیبێ کە ئێمە دەمانەوێو بیری لێ دەکەینەوە ؟ بێگومان نەء .

ئەی چارەسەری ئەمە چۆن دەکرێت ؟

ئەوەی کە من لە دڵمدایەو حەزم دەکرد وابێت وا نەبوو . من ئەگەر بۆم بلوایەو پشتەسووری ئەوە بوایەم کە یەکێك یان دەزگایەك بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە لە ئەستۆی خۆی دەگرێت ، دەبوو هەر هیچ نەبێ یەك دوو لایەنی زۆر پێویست هەن بەم شێوەی ئێستە نەبن :

أ - وەك گوتم زمانی نووسینی کتێبەکە زمانی ئەو سەردەمەبەو ئەو تەئثیرانەی پێوەیە ، دیارە ئەو زمانە لەگەڵ زمانی نووسینی ئەمڕۆی کوردیدا کە چل ساڵیان تێوانەو چلساڵە ئەم زمانە لە گەشەکردنو بۆ پێشەوەچووندایە جیاوازییان زۆرەو ، خوێنەری ئەمڕۆ باش توانای بەسەر نووسینی چل ساڵ لەمەوبەردا ناشکێو ، دەبوو من کارێکی وام بکردایە زمانی کتێبەکەم بە شەرحو پەراوێز لە زمانی کوردیی ئەمڕۆ نزیك بخستایەتەوە ، بەڵام کە سەرنجی بارو دۆخی چاپەمەنی کوردی

بدرێت‌و بزانین پاش هەزار زەحمەت‌و ئەم‌بەرەوبەر توانیبێتم ئەم کتێبـــەم بەم شێوە لەم ماوە دوورو درێژەدا چاپ‌کردبێت ، ئـەگـەر ئەو شـەرح‌و پەراوێزەم بۆ بکردایە کە نزیکەی ئەوەندەی کەی دەچوە ســـەر دەبـوو سی‌سالێکم بۆ تەرخان بکردایە ، جگە لەوەی کە لەوانە بوو هەر ســـەری تیـا بچێت •

ب ـ جگە لەوەیش ئەم کتێبە یەکەم کتێبی کوردییـە کە بـەم شێوە دانرابێت‌و چاپ‌کرابێت ، گەلانی موسوڵمانی خواپێداو لە خزمەتکردنی فەرمایشتەکانی پێغەمەردا ـ د ـ زۆر پێشکەوتوون‌و ، دەیان خـزمـــەتـی جۆراوجۆری ئەم فەرمایشتە جوانانەیان کردوەو ، دەیان کتێبی نایابیان لێ دەرهێناوەو ، جاری وایش هەیە بۆ یەك دوو حەدیث نامیلـــکەو کتێبـی تایبەتیی نووسراوە • ئەگەر منیش بهاتایەم لـەم روەیشـــەوە خـەریـکی لێکدانەوەی هەندێ شوێنی پێویست بوایەم هەر زۆر زۆرتری دەویست‌و کار لەوە فراوانتر دەبوو کە وا بە ئاسانیی دەستی لێ هەڵگرم • با ئەمەیش بمێنێ‌و ئەگەر خوا مۆڵەت‌و توانای دام بۆ خـــۆم‌و ، ئەگـــەر عـومری ئەمانەتیشی لێ وەرگرتمەوە بەڵکو بە هیمەتی بە تواناو لێهاتووان شـــتێك بـــکرێت •

٢ ـ ناڵێم لە لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبەدا ئەوەی پێویست بێ کردوومەو، هیچم نەپێلاوەتەوەو چۆن باش بێ وام کردوە • بەڵکو گەلێ لایەن هەیـە جگە لەوانەی کە لێرەدا باسم کردوون دەبوو لە ئێستە باشتر بـوایـەن‌و تەسەلتر بوایەن ، بەڵام دووبارە ئەم کارە ئەوە نیە کـە هەموو لایـەنێکی تەواو بکرێت‌و بێ‌کەم‌و کووڕیی بێت • ئەوەی کـە دڵخۆشیی خۆمی پێ ئەدەمەوەو ، بـە هیوایشم لای خوا پاکانەم بۆ بـکات ، بـەڵـکـو بـۆ هەڵەکانیشم چاوەڕوانی پاداش بکەم ، ئەوەیە کە هیچ کات لە کاری خۆم

رازیی نەبووم‌و ، لەخۆبایی‌بوون لە دڵمدا نەبوەو ، هەمیشەیش هەوڵی ئەوەم بوە کاری ئەمڕۆ لە دوێنێ‌و سبەینێ لە ئەمڕۆ باشتر بێت‌و ، هەرگیز ڕێگەم نەداوە بەوە کە ماندوبوون ڕێگەی ناو هەست‌و دەروونمی هەبێ‌و. بیرم لەوەیش نەکردوەتەوە کە چەندێ کاتم بۆ شتێکی بچووك خەرج کردوەو ، جاری وا هەبوە شەوێکی تەواو تا شەکەت بووم بۆ حەدیثێك گەڕاوم‌و کە ئەنجام لە پەل‌و پۆ کەوتووم ، ئەوسا گەیشتبمە ئەنجام یان نا دەستم لێ‌هەڵگرتوە • رۆژ بەڕۆژو مانگ بەمانگ‌و ساڵ بەساڵیش زیاتر دەستم بۆ داگرتوەو پتر چوومەتە ژێر باری ئەوە کە کارەکەم بە گوێرەی توانا پوختترو بێ‌هەڵەترو تەواوتر بێت • هەر لەبەر ئەمەیشە ئەگەر یەکێك لێم‌بپرسێ : لە ڕووی لێکۆڵینەوەوە کام بەرگیان لە کام بەرگیان باشترە ؟ لە دواوە پێدا دەگەڕێمەوەو ئەڵێم ( نۆ ) لە ( هەشت )و ، هەشت لە حەوت ••• باشترەو بەو پێیە •

٣ ـ شتێکی دیکەیش کە لەم ڕوەوە بوە بە هۆی ماندوبوونم نەبوونی نوسخەی پێویستی کتێبی ( ارشاد الساری فی شرح صحیح البخاری ) بوە • واتە نوسخەی ئەو چاپەی کە مامۆستا مەلا ڕەشید کتێبەکەی لێ دەرهێناوە لە بەردەستمدا نەبوەو ، ئەو ژمارانەی ئەو ئیشارەی بۆ کردوون لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەکانی چاپەکەی بەردەستی مندا وەك یەك نین‌و ،جاری وا هەبوە بۆ حەدیثێك چەند بەرگ‌و لاپەڕە گەڕاوم ، کە ئەگەر چاپەکەی لەمەڕ مامۆستام لابوایەت ئەو دەردەسەرییەم نەئەچەشت‌و کاتیشم بەزایە نەدەچوو •

٤ ـ من خۆم پێش هەموو کەس دەڵێم : لەم کتێبەدا وەك نەمتوانی پەیڕەوی ئەو ڕێنوسە بکەم کە دانەر لە سەرەتای کتێبەکەوە نوسیویەتی‌و خۆیشی پەیڕەوی کردوەو ، لە پێشەکی بەرگی یەکەمدا باسی کراوە ••

نەیشمتوانی پەیڕەوی یەك ڕێنووسی بێ جیاوازیی‌و ئـاڵ‌و گۆڕ بكـەم ؛ چونكە تا ئێستە ڕێنووسی كوردی لە ئاڵ‌و گۆڕدایەو هێشتا لەسەر یاسایەكی چەسپ‌و پتەو دانەمەزراوەو ، من خۆیشم لـە گەلێ ڕووەوە - بـە هۆی بوونم‌و كاركردنم لەم بوارەدا - ســـەرنجـم دەربارەی ڕێنووسی بـاوی ئێستەی كوردی هەیەو ، كـاتی وایش هـەبوە ماوەیــەك بـە شێوەیـەك نووسیومەو دوایی بە لامەوە پەسەند نەبوەو گواستوومەتەوە بۆ ســــەر بارێكی دیكە كە بە لامەوە لەوی دی پەسەندتر بوە .

- ٤ -

**ڕێبازی ڕاستكردنەوەو لێكۆڵینەوەم :**

١ - بۆ دەقە عەرەبییەكە بە گوێرەی توانا گەڕاومەتەوە سەر سەرچاوە ئەصلییەكە كە ( ارشاد الساری )ەو دەقە عەرەبییەكەم لـەگـەڵ بوخاریی‌و موسلیمەكەدا بەراورد كردوە ؛ جا ئەگەر هەڵەیەكی بچووكی وەك خـاڵ‌و هەڵەی ڕێنووس، وەك هەمزەی سەر كورسیی بێ كورسیی نووسرابێ یان بە پێچەوانەوەو ، نەبوون‌و بوونی (ال) ... تووش بووبم ڕێگەم بـە خـۆم داوەو ، هەر لە دەقەكەدا چاكم كردوون‌و لە پەراوێزیشەوە باسم نەكردوون؛ چونكە لە لایەكەوە هەڵەكان بچووكن‌و ، ئاشكرایە لەبیرچوونە ، لە لایەكی دیكەیشەوە دەقی ڕاست‌و باوەڕپێكراوی ئەصڵەكـەم لەبەردەســـتدایەو پێویست ناكا بۆ ئەو جۆرە شتانە پەراوێزی زۆر بنووسم . ئەگەر هەڵەكە لەوانەیش زیاتر بووبێ ، وەك كەوتن ، یان گۆڕانی وشەیەك ، هـاتـووم دووبارە لە شوێنەكەی خۆیدا چاكم كردوە ، بەڵام ئیشارەیەكی تایبەتی ئاوام = = دانـاوە . واتە لە هەر شوێنێكی ئەم كتێبــەدا شتێكی ئـاوات بەرچاوكەوت ، كە وشەیەك یان زیاتر لە نێوان ئەو دوو نیشانەدا نووسرابوو، ئەوە بزانە ئەوە یـان لــە نوسخەكـــەی مامۆســتادا هـــەر نەبوە یـــان

بە هەڵە نووسراوە • جاری وایش هەیە بێ نیشانەدانان هەڵەکەم چاككردوەو لە پەراوێزەوە باسمکردوە •

لە نووسینەوەی تەرجەمەکەدا زیاتر رێگەم بە خۆم داوە بۆ چاككردنی هەڵە ئەویش لەبەر یەك دوو شت :

أ - ئەو کوردییەی دانەر پێیئووسیوە ، واتە شێوەو زاراوەی گفتوگۆو نووسینی ، هەمان زاراوەو شێوەیە کە من پێی ئەدوێمو زۆر کەم جیاوازیم لەمەدا هەستکردوە ، بۆیە بە ئاسانی توانیومە بزانم کامە هەڵەیەو کامە راستەو ، کاتێ هەڵەیەکی بچووکی دانەرم دیبێ هەندێ جار بێ ئەوەی پەراوێزی بۆ بکەم لە شوێنی خۆیدا چاکم کردوە •

ب - دەسخەتەکەی بەردەستم دەسخەتی دانەر خۆیەتیو گومانی ئەوەی لێ ناکرێ هەڵەو گۆڕان لە نووسینەوەدا رووی‌دابێ •

ج - بە بەراوردکردنیش لەگەڵ دەقە عەرەبییەکەدا باشترو رووتر هەڵەکە دەرکەوتوە •

د - زیاد لەمانەیش لە وەصیەتنامەکەی دانەردا - خ - خوێندمانەوە کە ئیجازەی چاككردنی هەڵەکانی داوە •

٢ - دانەر - خ - لە نووسینی تەرجەمەکەدا ، وەك لە دەقە عەرەبییەکەدا کردوویە ، سوور بوە لەسەر ئەوەی کە دۆعا بۆ هەر کەسێك بە گوێرەی خۆی بکات ؛ واتە بۆ پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - و بۆ یارانی - رضي الله تعالی عنهم - و ، بۆ دوای ئەوان - رحمه الله تعالی - بەڵام کاتی وا هەیە ناوی ئەصحابو کافرو تابیعیو غەیریان بە دوای یەکدا هاتوونو ، ئەویش ویستوویەتی ئەو پەیڕەوییەی بۆ رێبازەکەی خۆی نەپسێنێ ؛ بۆ نموونە :

٥٣/٢٢٩٠ ـ عن أبي بردة بن أبي موسى الأشعري [ رضي الله تعالى عنه ورحمه ] دانەر ـ خ ـ لە ژێر ( عنه )دا ژمارە ( ٣ )ی داناوە ، لە ژێر ( رحمه )یشدا ژمارە ( ٢ )ی داناوە ـ لەولایشەوە لە ژێر ( أبي موسى )دا ژمارە (٣)ی داناوەو ، لە ژێر (أبي بردة)دا ژمـــارە (٢)ی داناوە ، واتــە مەبەستی ئەوەیە ( رضي الله )ەکە بۆ ئەبوموسایەو ( رحمه الله )ەکە بـــۆ ئــەبوبـــوردەیــە •

ئەم نموونەم بۆ روونکردنەوە هێنایەوەو ، ئــەمەیش لە چــاپەمەنی ئەمڕۆدا چاودێری ناکرێتو ، ئەگەر بە پەراوێزیش چـارمـان بـکردایـە بەشێکی تایبەتیی خۆی دەویست •

٣ ـ دانەر ـخ ـ بەرانبەر هەندێ کەسو چەند بابەتێك رای تایبەتیی خۆی هەیەو ، راکەیشی نەبوونو نەنووسینی باشترە لە نووسینی ، هەندێ جار ئەو رایانەم نەنووسیوەو لــە بــاتــی ئەو بوێرراوە ئــەم نیشـــانەم [ ••• •• ] دانـــاوە •

لێرەدا کە ـبە شەرمەوە ـباسی ئەركو کاری لێکۆڵینەوە دەکەم گومانم لەوەدا نیە کارەکەم ناتەواویی زۆرەو ، دەبــوو گەلێ لە ئێســـتە باشترو پوختتر بــێ • بەڵام :

لە لایەکەوە ـوەك مامۆستا مەلا رەشید فەرمووی ـکارەکە بــارێکی قورسەو ، کارو باری وایش لە لای گەلانی خواپێداوی ئەم چەرخە بــە تەنهاکەس ناکرێتو ، کتێبێکی تۆبەرگیی ئاوا بە لێکۆڵینەوەیی‌و ، گەڕانو خەمخواردنی دەرامەت بۆ لە چاپدانی‌و ، سەرپەرشتیکردنی چاپی‌و ، ناردنی بۆ شارانو ، دابەشــکردنــی بە سەر کتێبخانەکانـــداو ، مشوورخواردنی بڵاوبوونەوەی •••وە بە تەنهابال ناسپێررێتو ، لەوانەیە ـئەگەر لیژنەیەك

ئەنجامی نەدا ـ هەر لایەنێکیان چەند کەسی شارەزاو کارامەی بێ خەمی بۆ تەرخان بکرێت •

لەولایشەوە بارودۆخی چاپەمەنیی کوردیو ،نەبوونی کرێکاری کوردیزانو ، تەنگوچەڵەمەی کار لەم مەیدانەدا لە شارەزایانی ئەم بوارە شاراوە نیەو ، ئەم لایەنەیش ئەرکو رەنجو ماندووبوونو کات بەفیڕۆچوونی نووسەری کورد چەند چەندانی نووسەرانی دیکە لێ دەکات !

ئەمە تەنها بۆ روونکردنەوە دەنووسمو نامەوێ پاساوی هەڵەو ناتەواویی کارەکەمی پێ بدەم ، چونکە ئەوەی پاکانەم بۆ دەکاتو دڵخۆشیی خۆمی پێ دەدەمەوە ، ئەوەیە بە گوێرەی توانا درێغیم لە هەوڵو کۆششدا نەکردوەو ، وەك پێشتریش گوتم ، رۆژبەڕۆژ زیاتر دەستم لە لێکۆڵینەوەدا داگرتوەو ، کات دوای کات زیاتر بە تەنگ پوختیو بێ کەمو کووڕیی ئیشەکەمەوە بوومو ، شەو بەشەو زیاتر پێشوازیم لە شەونخوونیی کردوە•••بۆیە دەتوانم بڵێم سووچێکی «ليس في الامكان أبدع مما كان» یش پاڵپشتی ئەم قسەیە دەکات •

— ٥ —

وەك سەرنجدانێکی کاری مامۆستا مەلا رەشید بەگ ـخـلەم کتێبەدا ئەوە روون دەکەمەوە کە مامۆستا هەوڵی ئەوەی داوە ـ وەك خۆی ئەفەرموێ ـ هیچ حەدیثێك تەرك نەکاو نەبوێرێو ، بۆ ئەم مەبەستە گەلێ جار چەندین حەدیثی لە یەك بابەتا نووسیوە کە جیاوازییەکی کەم لە نێوانیاندا هەیەو دوایی خۆی فەرموویەتی : « ئیتربەسە » یان : «زۆرن مەعنایان هەموو یەکێکە » • یان ئەفەرموێ : « پێنج حەدیث یەك مەئال » یان : « ئەم حەدیثانە بە مەئال یەکێکن » ••• تاد

بەڵام لەگەڵ ئەم بیندرێژییو ، پشووقووڵیو ، بەتواناییەیدا گەلێ حەدیثی بواردوەو گەلێ جاریش دووپاتبوونەوەی بەسەردا تێپەڕێوە • بۆ ئەمە دەكرا لە هەر بابێكدا حەدیثە بوێرراوەكان بنووسرێن ، یان كتێبێكی تایبەتی لە ( استدراكات )و بەسەرگرتنەوەو بەســەركــردنەوەی ئــەو حەدیثانەدا بنووسرێت • ئەمەیش دووبارە كارێكە بۆ خۆیو زەلامو كاتی خۆی دەوێتو ، خودا یارمەتیدەر بێت !

دانەر خۆی هەستی بە لایەنی دووپاتبوونەوە كردوەو گەلێ جـار باسی ئەوەی كردوە كە رەنگە ئەم حەدیثەی لە فلان بابو شوێندا نووسیبێ، بەڵام تەواوی كتێبەكەی لەبەر دەستدا نەبوە تا بگەڕێتەوە سەر شوێنەكە، چونكە بەشبەش موسوەددەی كتێبەكەی ناردوەتەوە بۆ سلێمانیو هیـچ لای خۆی لە توركیا نەماوەتەوە • لەبەر ئەمەیە لە ل : (٢٧٨)ی بـەرگی چوارەمدا دەفەرموێ : «ئەگەر تیكراری بەعزێ حەدیث بین لە ( مجمـع البحرین )ا عەیبم لێ مەگرن ، موكەرەرەكەی طەی بكەن » •

لە رووی سەرنجدانی كاری دانەرەوە لایـەنـی گەشو ورشـەدار زۆرزۆرنو ، من لەم ماوە دوورو درێژەدا كە لە خزمەت ئەم فەرمایشـتە جوانانەو ئەم كتێبە پیرۆزەدا ژیاوم رۆژ بەرۆژ ســـەرسامیم لـە توانـاو بلیمەتییو دەسبەباڵەوەگرتنیخودا بۆ ئەم مەردە لــەم ئیشـەیدا زیـادی كردوەو ، لەگەڵ وردەكارییدا سەرسام بووم ، لەگـــەڵ پوختەنووسـیو بێهەڵەنووسینەوەییدا واقمورماوە ، لەگـــەڵ ئەمانـەتو پێشكەوتنی لە چەرخی خۆیدا بیرم بۆ چەندین لا چوە ••• هەر ئەوەندە دەڵێم : خودا ئەم پیاوەی بۆ ئەم فەرمایشتە پیرۆزانە رەخساندوەو خۆیشی یـارمـەتیی داوەوبـەس !

ئەو لایەنانەی کە جێگەی سەرنجن گەلێکن‌و لـەوە زیاترن لێرەدا بژمێررێن ، بەلاّم هەر بۆ نموونە وەرگرتن گەشتێکیان پێدا دەکەم :

١ ـ لایەنی تەرجەمەو وەرگێرانی دەقەکە :

بەلێ دانەر وشەو رستەی عەرەبیی ، وەك گفتوگۆو نووسینی ئـەو سەردەمە ، زۆر بەکار هێناوە ، بەلاّم لە مەرجەکانی وەرگێران‌و تەرجەمەدا زۆر وردو بە سەلیقە بوەو ، گومانم بۆ ئەوە دەچێت کە لەو سەردەمـەدا مەعهەدو قوتابخانەی فێرکردنی تەرجەمە لەو ناوەدا بوویێت‌و دانەر لـەو شوێنانەدا فێری ئەم فەنە بوویێت‌و ، قسەیێکی خۆیشی کە ئەفەرموێ : « أعنت : صەحیحە • (عنت) لە (عنو)ە ناقیصە • ئـەم تـۆزە موخالیفی شەرطی تەرجەمەیە بۆ عەوام ، ئەمما مەجبوورییە •» ( حەدیثی ٣٠٤١/١٩) هەندێ پالّپشتی ئەم گومانەم دەکا ؛ چونکە دوای چل سالّ نووسـین‌و بۆ پێشەوەچوونی زمانی کوردی ئێستەیش تەرجەمەکەی ئەم لـە پێش تەرجەمەی زۆر لە نووسەران‌و وەرگێرانی ئەمرۆی کـوردەوەیە ، بە تایبەتی ئەوانەی من وەرگێرانیانم لە بابەتی تەفسـیرو حەدیث‌و کتێبی ئـایینیدا دیوە ئەم ئەگەر لە پێش هەموویانەوە نەبێ سلاّوی بـەسـەر زۆربەیاندا هەیە • بۆ نموونە ئێستەیش زۆربەی ئەو وەرگێرانە هەر لـە ژێر باری تەرجەمەی حەرفی‌و وشەبەوشەدا دەژین‌و کەمتریان دەتـوانێ وەرگێرانەکەی بخاتە قالّبێکی کوردییەوەو (کوردییەکەیان بـە عەرەبـی نەنووسن ) • بەلاّم ئەمە لای مامۆستامان بە دەگـمەن رێ‌دەکـەوێت‌و کوردییـەکەی کوردانەو بێ قۆرت‌و گرێیە •

٢ ـ ئەمانەتی علمی‌و پێشکەوتنی لە چەرخی خۆی :

کە خوێنەر بـە وردیی ئـەم کتێبە دەخوێنێتەوەو سەرنجی ئـەرك‌و ماندوبوونی مامۆستا مەلا رەشید دەدات‌و ، سـەرجەمی ئـەو ئـەرك‌و

ماندوبوونه لەگەڵ قەوارەو قلختی کتێبەکەو ، ئـەو ماوەی کتێبەکـــەی تێدا نووسراوەتەوەو ئەو تەمەنەی دانەر تیادا خەریکی دانانی کتێبـەکـە بوەو ، ئەو شێوە رێكەو پێكەو پوختەی کتێبەکەی پێ نووسراوەتەوە •• بەراورد دەکات لـە گەڵێ روەوە ســـەرسامیی رووی تێدەکاتو بـۆی دەردەکەوێ کە لە بەرامبەری کارێکی ئاسایی و ، کتێبێکی وەك هـەموو کتێبەکانی دیکەدا نیەو ، ئەم ئیشە وزەو توانایەکی گـەلێ تایبەتی بـــۆ بەکاربراوە ، دەستی زانایەکی کەم وێنەو ، بیری بلیمەتێکی کەم هـاوتـا داڕشتوە ! تۆ لەگەڵ مندا ـ بـە ئەرکی مەزانە ـ چەند بەرگیکی ئـــەم شاکارە ئەمدیوو ئەودیو بکەو ، هەندێك لاپەڕە هەڵدەرەوەو ، لـە نـاو توێی لاپەڕەو دێڕەکان وردبەرەوە بزانە ئەم زانا بـلیمەتـە چ رەنجێکی داوە ؟!

پێشەکی بۆ هەموو حەدیثێك بە گوێرەی توانا سەرچاوەکەی بـــە وردیو روونی نووسیوەو ، وای کردوە ئەگەر خوێنەر گوماتێـکی بـۆ پەیدا بوو بێ ســـەرئێشـەو گەڕانو مانـدوبـوون بتوانێ بگـاتـەوە سەرچاوەکەو گومانەکەی لابەرێت • دوای ئەوە نەیفەرموە : من خەریکی تەرجەمەم بۆ کوردیو ئیتر پێویست ناکات بێم هەموو حەدیثە عەرەبییەکان بنووسمەوە • بەڵکو بەوەیشەوە نەوەستاوەو هەر شوێنو وشـەیـەکـی گرانی لە حـــەدیثـــە عەرەبییەکاندا دیبێ چوەتـــەوە بۆ لای نەوەویو قەسطەلانیو بە گوێرەی ئەو مانا ئەوان بۆیان کردوە حەدیثە عەرەبییەکەی بـە عەرەبیو لە نێو دوو کەوانی تایبەتیدا ـ بۆ ئەوەی شەرحو حـەدیث تێکەڵاو نەبن ـ مـــانا لێکداوەتـــەوەو ، وشە عـــەرەبییـــە نـامـۆو کەمبیسراوەکانی بە سەروبۆربۆکردن ئاسانو خۆشخوێن کردوون • جاری وایش هەیە بەوەیشەوە نەوەستـــاوەو لە ناو دەقە عەرەبییەکـەیشدا پێش

تەرجەمـە کوردییەکە وشەگرانەکانی بە کوردی مانا کردوە • ئەمانەیش هەمووی بێ ئەوەی شتێکی وای کردبێ یەکێك لە یەکێك بکەوێو شەرحو مەتن تێکەڵاو بین ، بەڵکو وەك گوتم بۆ هەموویان کەوانەو ئیشارەی تایبەتی داناوەو وای جیاکردوونەتەوە کە خوێنەر کاتێ تەماشای دەکا وەك کتێبێکی ئـەکـادیمییانـەی پێشـکەوتـووی سەرکـەوتووی ئـەمڕۆ بخوێنێتەوە وایـە •

کە ئەم کارەیشی کردوە دەقی حەدیثەکانی بە ئـامادەکـراویو بـە جیاکراوەیی لە بەردەستدا نەبوە • بەڵکو گەڕاوە وشەبەوشەو، دێڕبەدێڕ لە ناو کتێبی ( ارشاد الساری لشرح صحیح البـخاری )دا حەدیثەکانی وشەـوشە لە ناو کەوانەکان دەرهێناوەو کـۆی کردوونەتەومو ، یـەکی خستوونو نووسیونیو جیاوازیی ریوایەتو نوسخەو دەقەکانی بە هەمان ئەمانەتو بە شێوە جوانو پوختەکەی خۆی تۆمارکردوە •

٣ ـ نووسینەوەی بێ هەڵەو بێ کووژاننەوە :

من لە خۆم دائەگرمو کاتێك ئەمەوێ شتێك تەرجەمە بکەم ئەگـەر یەك دوو جار نەینووسمەوەو بە وردیی خەریکی تەرجەمەکەی نەبم لەوانەیە لە چەند لاوە هەڵەی تێدا بکەمو بیکووژێنمەوەو دەسـکاریی بکـەم • بەڵام ئەم کارەی مامۆستامان لەم روەیشەوە زۆر سەرسوڕهێنەرە • لـە نووسینێکیا کـە بۆ مامۆستا مەلا حسـەینی نووسیوە دەفـەرمـوێ : «••• ئەمەیشت عەرز بکەم ئەم وەرەقانە کە ئەینێرم بە خدمەتی بگـەی ( تأمل ؛ لأنها أحادیث ) هەم تەبیضە هەم موسوەددەیە ، لە خدمەت هیچی تریانا نیم کە بزانم موکەڕەڕی تیایە یا تیا نیە • رەنگە زۆری تیا بێ ، شایەد فەرقیان نەبێ مەینووسن • ( والسلام علیکم والسلام ) •» (ل : ٢٠٥/٣) واتە هەر یەك جاری نووسیوەتەوە • دەی ئەم شاکارە بەم هەموو وردەکاریو

ئەمانەتو رێكو پوختیەوە چۆن ئاوا یەكدەست بێ كـــووژانەوەو هــەڵە گـــونجـــاوە ؟!!

هەروەها جێگەی سەرسوڕمانێكی ترە كـــە دانەر توانیویەتی لـــەو تەمەنەدا كە خۆی دەفەرموێ : « ذیهنم كولبوە ، دەستم زۆر ئەلەرزێ ، مەرەكەب هەمووی بۆیایە دایئەداتە ئەودیوەوە ، قەڵـەمی خـۆمان نیـە ، كاغەزی چاك نیە ، هـەر ئەوەندە ئەتـوانم ٠٠٠» ( ل : ٣/٢٠٤ ) چۆن بۆی كراوە لە ( ٢٢ )[1] مانگدا لـەم دوو دەریا بێ پەیـەدا مەلە بكاتو بـــە پشوقوولییەوە بگاتە بنیانو دوڕو گەوهەریان لێ دەربهێنێو بەو شـــێوە جوانە بیانهونێتەوەو بیكا بە دیاریی دەستی پیرێكی پیرۆزی دڵســــۆزی گەلو ئایینو، سنگو دەروونی هەموو مرۆڤێكی خاوەن باوەڕی پێ زاخاو بداتەوەو یادگارێكی شاكاری هەمیشەزیندوو لە پاش خۆی بەجێ بهێڵێ؟! كاتێ مرۆڤی بە ویژدان سەرنجی ئەم ئەنجامە بدات لەگەڵ هەموو سەرنجدانو وردبوونەوەیەكیدا سەرسوڕمانی زیاتر دەبێتو ، وەڵامی زۆریشیان ـ جگە لەوەی كە خوا وەك موعجیزەیەك بۆ پێغەمەر ـ د ـ لە پاش خۆی ئیشی ئاوای بۆ ئەكاو زەلامی ئاوای بۆ ئەڕەخسێنێ ـ نازانێ !

بۆیە دەڵێـــم : ئەگەر ئەم زانا مەزنە لە هەرەتی لاویدا لە باتی دووریی دەربەدەریو گەڕان بۆ نانو ژیانو بینینی چەندین فەرمانو كاری میریی، باری لەباری بۆ بلوایەو بە كاری نووسینی شاكاری ئاواوە خەریك بوایـە دەبوو چەند كاری گەورەی بۆ دینو دنیای ئەنجام بدایە ؟؟؟

والحمـــد لله رب العالمين ، والصـــلاة والســــــلام
على ســـيدنـا محمـــد وآلـــه وأصحابـــه أجمعين .

(١) مامۆستام لە هەرەتی پیریو دوادوایی تەمەنیدا بە (٢٢) مانگ كارەكەی تەواوكردوە ، بەڵام من كە لە تافی لاویدا شانم دایەژێری دوور نیـــە ـ تا بەرگی دوەمیش تەواو دەبێت ـ بۆ لێبوونەوەی (٢٢) سالم بوێت !

# بابەتو سەرباسەکانی ئەم بەرگـە

| لاپەڕە | | بـــابـــەت |
|---|---|---|
| ٢٤ | ـ | ئیبنوعومەرو شەریکی نەواس |
| ٢٥ | ـ | کەسبی حەججام حەلاڵـە |
| ٢٦ | ـ | جارێکی تر خیار لە نێوان کڕیارو فرۆشەرا |
| ٢٦ | ـ | لە پێش قەبضا فرۆتن یا هیبەکردنی مەبیع |
| ٢٨ | ـ | مامەڵەیەك لە نێوان عوثمانو عەبدوڵلای کوڕی عومەرا |
| ٢٩ | ـ | پیاوێك کە فێڵی لێ ئەکرا پێغەمەر ـص ـ چی پێوت ؟ |
| ٢٩ | ـ | بۆ شتکڕین بەرەوپیری‌چوونی ئەوانەی کە شت یێننە شار |
| ٣٠ | ـ | لـە گۆترە طەعام کڕینو فرۆتن |
| ٣١ | ـ | طـەعام پێـــوان |
| ٣١ | ـ | شتی کڕراو تا وەرنەگیرێ نافرۆشرێ |
| ٣٢ | ـ | مامەڵە نەهی‌لێ‌کراوەکان |
| ٣٣ | ـ | بەیعی غەرەرو ( حبل الحبلة ) |
| ٣٤ | ـ | بەیعی مولامەسەو مونابەذە |
| ٣٤ | ـ | بەرەوپیری‌چوونی شت بۆ کڕینی |
| ٣٥ | ـ | خەڵقی شاریی شت بۆ دەشتەکیی نەفرۆشێ |
| ٣٦ | ـ | ئیحتیکـــار |
| ٣٧ | ـ | پارەی فرۆشتنی ســەگ |
| ٣٨ | ـ | بەیعی مردارەوەبوو و شەرابو بەرازو شتی پیس |
| ٤٠ | ـ | فرۆشتنی بەرو بوومو شتێ کە ریبای تیابێت |
| ٤١ | ـ | شت کێشانەو پێوانەی دیار نەبێ نافرۆشرێ |
| ٤٢ | ـ | ریبا لـە خورمادا |
| ٤٤ | ـ | ریبا لـە پـارەدا |
| ٤٦ | ـ | کڕینی دەستبەدەستو بێ قەرز |
| ٤٧ | ـ | گۆڕینەوەی شتی هاووێنە ئەبێ دەستبەدەستو وەك یەك بن |
| ٤٨ | ـ | کراء الارض ـ بەکرێدانی زەویو زار |
| ٤٩ | ـ | ئاوێریی‌و زەوی‌بەمولکانەدان |
| ٥٠ | ـ | الحرث والمزارعة ـ کشتوکاڵکردن ـ |
| ٥١ | ـ | خـــراپیی گـــاســـن |
| ٥٢ | ـ | نیوەکاریی‌و ئاوێریی |
| ٥٣ | ـ | خێری کشتوکاڵ کـردن |
| ٥٤ | ـ | میوە تا نەگەیێ نافرۆشرێ |

| لاپەڕە | بـــابـــەت |
| --- | --- |

| لاپەڕە | بــــابـــەت |
|---|---|

| لاپەڕە | بـــابـــەت |
|---|---|

| لاپەڕە | بــابــەت |
| --- | --- |

| لاپەڕە | بـابـــەت |
|---|---|
| ١٧٩ ـ | نیکاحو وەلیی لـــە نیکاحدا |
| ١٨٢ ـ | بێوەژن ئەحەقە بە نەفسی خۆی |
| ١٨٣ ـ | سەبەبی نوزوولی ( فلا تعضلوهن ) |
| ١٨٣ ـ | نیکاحی زەمانی جاهیلییەت |
| ١٨٥ ـ | نیکاحی موتعە ـ صیغەکردن |
| ١٨٧ ـ | لە نێوان ئیبنوزوبەیرو ئیبنوعەباسا دەربارەی موتعە |
| ١٩٠ ـ | روبەیعی کوڕی سەبرە دەربارەی موتعەکردن دەدوێ |
| ١٩١ ـ | دەربارەی موتعە لە ئیبنوعەباس پرسرا |
| ١٩٢ ـ | سەلەمەی کوڕی ئەکوەعیش دەربارەی موتعە دەدوێ |
| ١٩٣ ـ | ما يحرم من النكاح ( ئەوانەی مارەکردنیان حەرامە ) |
| ١٩٥ ـ | ژنو پووری بە یەکەوە کۆناکرێنەوە |
| ١٩٦ ـ | نكـــاح المحـــــرم |
| ١٩٧ ـ | ئایـــەتی ( والمحصنات من النساء ) |
| ١٩٩ ـ | نیکاحی شیغار ، ژنبەژن بێ مارەیی |
| ٢٠٠ ـ | نیکاحی موشـریك |
| ٢٠٢ ـ | مارەکردنی ژنان لە کاتی هیجرەتیانا لە مەککەوە بۆ مەدینە |
| ٢٠٣ ـ | کە ژنو پیاو موسوڵمان بن نیکاحیان چی لێ دێت ؟ |
| ٢٠٤ ـ | العزل ـ نەیێلێ لە فەرجی ژنا ئینزالی مەنیی بێ بیرێژێتە دەرەوە |
| ٢٠٦ ـ | وطء الحـــامـــل |
| ٢٠٨ ـ | چوونەلای ژنانی مناڵ لەبەر |
| ٢٠٨ ـ | چوونەلای ژنانی مناڵ بەبەر |
| ٢٠٩ ـ | ئەندازەی مارەیی خێزانانی پێغەمەر ـصلى الله تعالى عليه وسلم ـ |
| ٢١٠ ـ | مارەکردنی صەفییەی دایکی موسوڵمانان |
| ٢١١ ـ | ئەندازەی خۆراکی شایی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ |
| ٢١٣ ـ | خۆراکی شایی زەینەب |
| ٢١٥ ـ | خوازبێنی زەینەب |
| ٢١٦ ـ | دەفلێدانی ژن لە شادییاو گۆرانییان لای پیاو |
| ٢١٧ ـ | ئیجابەتی دەعوەت ( وليمة او غيرها ) |
| ٢١٨ ـ | الولـد للفـراش |
| ٢٢١ ـ | الـرضـــــاع |

| لاپەڕە | بــابـــەت |
|---|---|

| بـابـــەت | لاپەڕە |
|---|---|

| بـابـــەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

# إقتران النيرين

# في

# مجمع البحرين

## المجلد السابع

تأليف
ملا رشيد بيگ بابان

تحقيق
محمد علي القره داغي

نرخى (چوار) دیناره

دار الحرية للطباعة
بغداد